دکتۆر مارف عومەر گوڵ

# جینۆسایدی گەلی کورد

## لەبەر ڕۆشنایی یاسای تازەی نێودەوڵەتاندا





ئەم چاپی پێنجە بەبۆنەی هەڵواسینی عەلی حەسەن مەجیدەوەیە کە بەهۆی کیمیابارانکردنی کوردستانەوە لەلایەن کوردەوە نازناوی عەلی کیمیاییی پێ برا.


ناوی کتێب: جینۆسایدی گەلی کورد

نووسینی: دکتۆر مارف عومەر گوڵ

بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٩٤٢

هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل

دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم

بەرگ: مریەم موتەقیان

چاپی پێنجەم، هەولێر- ٢٠١٠

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١١٠ی ساڵی ٢٠١٠ی دراوەتێ

## پێشکەش

بابە گیان!

لەبیرم ناچێتەوە! ڕۆژێک لە ڕۆژە سەختەکانی ١٩٨٨ بەدزیەوە یەکتریمان بینی!

وتم: دەچمە دەرەوەی وڵات بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەم.

وتت: چەندت پێ دەچێ؟

وتم: پێنج ساڵ.

وتت: ئای کە زۆرە؟

ئیتر هەر ئەو جارە بوو. نەمزانی جارێکی تر بەدیدارت شاد نابمەوە! من ڕۆیشتم و تۆش کۆچت کرد!

لە گەرمەی ڕۆژانی ئامادەکردنی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا بووم، نە ئاگاداربووم کە تۆ لە ژیاندا نەماوی، نە بیریشم بەلای مەرگی تۆدا دەچوو! بۆیە بەری ئەم ڕەنجەم پێشکەش بە یادی هەمیشە زیندووی تۆ!

# پێرست


پێشەکی چاپی چوارەم ........ 9

پێشەکی چاپی سێیەم ........ 10

پێشەکی چاپی دووەم ........ 11

پێشەکی چاپی یەکەم ........ 14

**بەشی یەکەم**

چەمکی جینۆساید وەکو تاوانێکی دڕندانە لە دژی مرۆڤایەتی ........ 21

پەراوێزەکانی بەشی یەکەم ........ 28

**بەشی دووەم**

سیاسەتی جینۆساید لە سەرانسەری کوردستاندا 33

فاکتی تاوانی جینۆساید لە باشووری کوردستان ........ 35

فاکتی تاوانی جینۆساید لە باکووری کوردستان ........ 72

فاکتی تاوانی جینۆساید لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ........ 92

فاکتی تاوانی جینۆساید لە ڕۆژئاوای کوردستان ........ 103

پەراوێزەکانی بەشی دووەم ........ 118

**بەشی سێیەم**

مافی گەلی کورد لە داکۆکی نێونەتەوەیی لەدژی جینۆساید ........ 135

پەراوێزەکانی بەشی سێیەم ........ 156

ئەنجام ........ 160

سەرجەمی سەرچاوەکان ........ 165

# پێشەکی چاپی چوارەم

چاپی چوارەم لە کاتێکدا دەکەوێتە بەردەست، چەند گۆڕانکارییەک لە عێراقدا ڕوویان داوە کە پەیوەندیدارن بە بابەتەکانی ئەم کتێبەوە:-

١- سەرۆکی پێشووی عێراق کە لە سەردەمی ئەودا تاوانی جینۆساید لە دژی کورد ئەنجام دراوە، بەهۆی دادگاییکردنی لەسەر کۆمەڵ کوژی شاری (دوجەیل)، لە لایەن دادگای باڵای تاوانەکانی عێراقەوە حوکمی ئیعدامی بۆ دەرچوو، لەگەڵ بەرزان تکریتی و عەواد بەندەر و تەها یاسین ڕەمەزاندا ئیعدام کران.

٢- ڕۆژی ٢٠٠٧/٦/٢٤ هەمان دادگای باڵای تاوانەکان لە عێراقدا حوکمی ئیعدامی بۆ عەلی حەسەن مەجید کە ناسراوە بە (عەلی کیمیاوی) لەگەڵ وەزیری بەرگری سەردەمی ڕژێمی سەدام (سوڵتان هاشم) و (حوسێن ڕەشید تکریتی) جێگری سەرۆکی ئەرکانی سوپای عێراق. هەروەها بڕیاری زیندانی دووکەسی تر بە حوکمی زیندانی (هەتا مردن) دەرچوو.

گرنگ لەم حوکمانە ئەوەیە بڕیارەکە لەلایەن دادگایەکی عێراقییەوە لەسەر تاوانەکانی ئەنفال دەرچوون و بە تاوانی جینۆساید حوکم دران. ئەوەی بۆ ئەم کتێبەی ئێمە بایەخدارە، حەڤدە ساڵ لەمەوبەر هەر لە مانگی شەشدا (ساڵی ١٩٩٠) ئەم لێکۆڵینەوەیە وەکو ماستەر نامە پێشکەشی زانکۆی کییڤ کراوە لە کۆماری ئۆکراین، بەڵام پاشتر دەوڵەمەندتر کراوە. بۆیە چاپی تازەی ئەم کتێبەمان لەم کاتەدا بەپێویست زانی.

م. ع. گوڵ - ٢٠٠٧/٦/٢٥

# وتەیەک بۆ چاپی سێیەم

ئەم چاپی سێیەمە لە کاتێکدایە کە سەدام حسێن و ژمارەیەک لە سەرانی پێشووی عێراق لە دادگادا دادگایی دەکرێن و یەکەم سەرۆکی دادگاکەش (ڕزگار محەمەد ئەمین) حاکمێکی کورد بوو.

هەروەها ڕۆژی ٢٣/١٢/٢٠٠٥ دادگایەکی هۆڵەندە لە شاری (دنهاخ-لاهای) حوکمی پانزە ساڵی دا بەسەر بازرگانی هۆڵەندی (فرانس ڤان ئانرات) بەتاوانی ئەوەی کە کەرەسەی کیمیاوی بردووە بۆ ڕژێمی پێشووی عێراق و ئەو کەرەسانەش وەکو گازی کیمیاوی لە هەڵەبجە و سەردەشت و چەند جێگایەکی تری کوردستاندا ڕژێمی سەدام لە دژی کورد بەکاری هێناون.

ئەمە بەڵگەیەکی یاسایی گرنگە و بەشداری کردنە لە تاوانی جینۆسایدی کوردا.

ناوەڕۆکی ئەم کتێبە کۆمەڵێک ڕاستی لە بواری تیۆری و پراکتیکدا ڕوون دەکاتەوە لە ئەنجامدانی جینۆسایددا، بۆ جاری سێیەم چاپکردنەوەی ئەم کتێبەمان بە پێویست زانی چونکە لەبەردەستدا نەماوە و ئێستاش زۆر باسی جینۆساید دەکرێ، لە کاتێکدا ئەم کتێبە یەکەم لێکۆڵینەوەی زانستی بووە تاوانەکانی ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان لە چوارچێوەی یاسای نێودەوڵەتاندا بخاتە بەر لێدوان و ڕوونی بکاتەوە کە سیاسەتی جینۆساید چۆن لە دژی کورد بەکارهاتووە. هەروەها پێویستە ئەوەش بڵێین کە بۆ یەکەم جار ئەم لێکۆڵینەوەیە جینۆسایدی بەو شێوەیە پۆلێن کردووە کە دەیخوێننەوە.

نووسەر ١٧/١/٢٠٠٦

# پێشەکی چاپی دووەم

کــۆتایی ســاڵی ١٩٨٨، لە ڕۆژانی کــۆتایی هێــرشی ئەنفــالەکــاندا، لە کوردستانەوە گەیشتمە زانکۆی کییف لە کۆماری ئۆکراین، کەوتمە خوێندن و کـارکردن لە خـوێندنی باڵای ئەو زانکۆیە. ئەو تاوانانەی کـە ڕژێمی جـارانی عێراق بە سەرۆکایەتی (سەدام حسێن) بەرانبەر بە گەلی کورد ئەنجامی دا، کارەساتێکی گەورەی وای دروست کرد، لەلای من زۆر زەحمەت بوو بە شیعر و وتار نووسین بتوانم باسی بکەم. میللەتێک خۆی و نیشتمانەکەی لە حاڵەتی کـوێربوونەوەدابوون. هەر ئەوە وای لێ کـردم کـە بەوردی سـەیری ئەو بارە نالەبارەی کورد بکەم، بۆ ئەمەش لە کاتی خـوێندنەوەو بـە دواداچووندا هێڵی هاوبەشی سیاسەتی ڕژێمە داگیرکەرەکانی هەر چوار بەشی کوردستانم بۆ ڕوون بۆوە. هـەر بۆیەش بە پێـویسـتم زانی بـاسی سـەرجـەم بەشـەکـانی کـوردسـتـان بکەم. ئەوەبوو سـاڵی (١٩٩٠) ئەو لێکۆڵینـەوەیەم وەکـو نـامـەی مـاسـتـەر کۆتایی پێ هێنا، ئیتـر لەو سەردەمـەوە تاوانی جینۆسـاید لە دژی میللەتەکەم نەک بوو بە بەشێک لە بیر و ئەندێشەم بەڵکو تەواوی ژیانمی داگیر کرد.

هەر لە دوای ئەو کارەوە، لە چەندین گفتوگۆ و سیمینـاردا بەفراوانی باسی تاوانی جـینۆسـایدم کـردووە. بەڵام سـاڵی (١٩٩٧) بەهـۆی یانەی کـوردی (مـیدیا)وە لە ئەمسـتـەردامی هۆڵەندە ئەو لێکۆڵینەوەیە (ئەم کتـێبـە) بۆ یەکەم جار چاپ کرا.

هەر لە سەرەتای نەوەدەکانەوە، هەندێ جار پێیان دەوتم، کە ئەو تاوانانەی لە کورد کراون وا قورس نین کە پێیان بوترێ جینۆساید. بەڵام خـۆشبەختانە ئەو ڕچە شکێنیــیـــەی من کـــاری چـەندین کـــەسی تری بەدوادا هـات و بە

تایبەتیش لە دوای کەوتنی ڕژێمی سەدام حسێنەوە لە ٢٠٠٣/٤/٩، ئیتر ژمارەی گۆڕستانی بە کۆمەڵ ئەوەندە بە فراوانی لە سەرانسەری عێراقدا دۆزرانەوەو بەڵگەنامە و ئامرازەکانی داپڵۆسین و تاوان نەک تەنها بۆ کورد بەڵکو بۆ هەموو دونیا دەرکەوت.

لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێم، ئەم لێکۆڵینەوەی من وەکو کارێکی زانستی پشتی بە بەڵگەنامە و ڕووداوی باوەڕ پێکراو بەستووە، بەڵام کارێکی سەخت و زەحمەت بوو لە ساڵانی ١٩٨٨-١٩٩٠ هەوڵ بدری سەرچاوەو بەڵگەنامەی پێویست لەسەر تاوانەکانی ڕژێم بەدەست بێت، بەڵام بە هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر ئەو کارە ئەنجامدرا، ئیتر لە ساڵی (١٩٩٠) بەدواوە لەکاتی خوێندنی دوکتۆرامدا هەر لە زانکۆی کییف توانیم سەرچاوەو بەڵگەنامەی پێویست بەدەست بێنم لە سەر تاوانەکانی ڕژێمی عێراق و کارەکە دەوڵەمەندتر بکەم لێرەدا با ئەوەش بڵێم، بەهۆی هەل و مەرجی سیاسییەوە، هەر لەو زانکۆیە لە سەرەتاوە بە قورسی ئەو کارەی من وەردەگیرا، بەڵام دوایی ناوی (جینۆسایدی کورد) لەلای زۆربەی مامۆستا و کارمەندانی زانکۆکە لەگەڵ ناوی مندا بەیەکەوە دەهات، دیارە ئەمە وەکو شانازییەکی گەورە دەگێڕمەوە.

زۆر بەداخەوە لەبەر دەستێوەردانی ڕژێمەکانی دەوروبەر ئاسان نەبوو جارێکی تر ئەم کتێبە لە کوردستان چاپ بکرێتەوە، بەڵکو هەندێ ژمارەی بە (فۆتۆکۆپی) لەبەر گیرایەوە و ئەندازەیەکی کەم بڵاو بۆوە.

هاتنی سوپای هاوپەیمانان بۆ عیراق و کەوتنی ڕژێمی (سەدام حسێن) هەل و مەرجێکی تازەی دروست کرد و سنووری ئازادی فراوانتر بوو، هەر بۆیەش ئەم چاپی دووەمە بەپێویست زانرا بۆ ئەوەی ئەم کتێبەش بچێتە پاڵ کتێبە ئاشکراکانەوە.

پێویستە ئەوە بڵێم، لە دوای بڵاوکردنەوەی بابەتەکانی ئەم کتێبە لەم ساڵانەی دواییدا، ژمارەیەک لەو بەڕێزانەی لەم بابەتە دەنووسن، هەندێ جار (بێ سڵەمینەوە!) لە ناوەڕۆکی ئەم کتێبە ڕادەگوێزن بۆ باسەکانی خۆیان،

چونكە سەرچاوەكانی كارەكەی من دیارە و ئەوانیش هەندێ جار خۆیان لە سەرچاوەكەی من (بێدەنگ) دەكەن.

بەهەر حاڵ، جیاوازی ئەم كارە لەو ساڵانەی كە تیایدا ئەنجامدرا لە چوارچێوەی لێكۆڵینەوەیەكی ئەكادیمیدا جێگای خۆی كردەوە، خۆشحاڵم بەوەی، ئەوەی لەم كتێبەدا زۆر دەمێكە باس كراوە، ئێستا ژمارەیەكی دیاری دڵسۆزان و خەمخۆرانی كورد كاری بۆ دەكەن و هەوڵ دەدەن دادگایەك پێك بهێنرێ بۆ دادگاییكردنی لێپرسراوانی ڕژێمی بەعس لە عێراقدا.

بابەتەكانی ئەم كتێبە ساڵانی (١٩٩٩-٢٠٠١) بە خوێندكارانی پۆلی یەكەم و خوێندكارانی خوێندنی باڵای كۆلیجی یاسای زانكۆی سلێمانی وتراونەتەوە.

م. ع. گوڵ

١/٨/٢٠٠٣ سلێمانی

## پێشەکی چاپی یەکەم

جینۆساید، لەبەر ئەوەی تاوانێکی نێو نەتەوەییە و ئەنجامی ترسناکی هەیە، بۆیە لەیاسای تازەی نێودەوڵەتاندا بە پەیماننامەیەکی تایبەت و گەلێ بەڵگەنامەی تر قەدەغە کراوە.

جینۆساید، تاوانێکی هەمەلایەنەیە، دەکرێ یەک جۆری پراکتیک بکرێت، وەکو نەهێشتنی بەدەنی، دەشکرێ هەمەجۆرە بێت وەکو جینۆسایدی کولتووری نەتەوەیی، بیۆلۆژی و ئابووری. لە هەموو ئەم حاڵەتانەشدا ئەم تاوانە تاوانێکی سەربەخۆیە و لێپرسینەوەی نێونەتەوەیی دەکەوێتە ئەستۆی تاوانکارانی.

گرنگی ئەم باسەی ئێمە لەوەدایە، یەکەم جارە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ بە زمانی کوردی پێشکەش دەکرێت کە تاوانی جینۆسایدی گەلی کورد لە یاسای نێودەوڵەتاندا ڕوون بکاتەوەو بەشێک لەو فاکتانە بخاتە ڕوو کە دەبنە بناغەی جینۆسایدێکی هەمەلایەنی گەلی ئێمە. ئەوەی لەم باسەدا مەبەستمانە، لەبەر ئەوەی پێشتر لێکۆڵینەوەی زانستی دەربارەی تاوانی جینۆسایدی گەلی کورد نەکراوە، ئێمە دەمانەوێ ماناو چەمکی یاسایی تاوانی جینۆساید ڕوون بکەینەوەو فاکتی ئەو تاوانانە بخەینە ڕوو کە لەباکوور و باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کوردستاندا، ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان بەپلان و بەرنامەی داڕێژراو بەدرێژایی مێژووی دابەشکردنی کوردستان لەنێوان عێراق و ئێران و سوریا و تورکیادا، لەپاش جەنگی یەکەمەوە لەدژی گەلی کورد ئەنجامی دەدەن. دیارە تۆمارکردنی سەرجەمی ئەو تاوانانە، کارێکی زۆر و لێکۆڵینەوەی مێژوویی زیاتری دەوێ، بۆیە مەبەستی سەرەکیمان ئەوەیە بەشێکی ئەو تاوانانە تۆمار بکەین، تا لەبەر ڕۆشنایی یاسای تازەی

نێودەوڵەتاندا بتوانین خەسڵەتی یاسایی ئەو تاوانانە ڕوون بکەینەوەو بگەینە ئەو ئەنجامەی کە سەرجەمی ئەو تاوانانە، تاوانی نێونەتەوەیی (جینۆساید) پێک دێنن، کە بەڕاستی لەدژی گەلی کورد پراکتیکە دەکرێ. لەبەر ئەوەی ئەم تاوانە تاوانێکی نێونەتەوەییە، دەبێتە فاکتەرێکی بەهێز بۆ ترازاندنی مەسەلەی کورد لەیاساو چوارچێوەی ئەو وڵاتانەو دەبێ لە یاسای نێودەوڵەتاندا چارەسەری بکرێ. ئەوەش ئەو مافە بەگەلی کورد ڕەوا دەبینێت کە داکۆکی لەبوونی خۆی بکات و داوا لە کۆمەڵگەی جیهانی بکات لەبەرپرسیارێتی نێونەتەوەیی تاوانکارانی جینۆساید خۆش نەبن، کە ئەو کاتە دەست تێوەردانێ ناوخۆی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان داگیر کردووە، دەبێتە کارێکی ڕەواو پاراستنی ئاشتی و پشتگیریکردنی گەلی کورد لە چارەسەری کێشەکەیدا. مەبەستێکی تریش کە دەمانەوێ ڕوونی بکەینەوە ئەوەیە کە جینۆساید نەک هەر لە سەردەمی شەڕداو هەر بەئامرازی جەنگی پێڕەو دەکرێ و ئەنجام دەدرێ، بەڵکو دەکرێ وەکو سیاسەتێک ڕەفتار بکرێ و لە سەردەمی ئاشتیشدا ئەو تاوانە ئەنجام بدرێ. سەرباری ئەوەش دەمانەوێ ئەوە بە سەلمێنین کە گەلی کورد وەکو بابەتی تاوانی نێونەتەوەیی (جینۆساید) مافی ئەوەی هەیە، داوای داکۆکییەکی جیهانی بکات، یەکەم بۆ ئەوەی تاوانکارانی جینۆساید لە لێپرسینەوەی نێونەتەوەیی دەرباز نەبن و سزا بخرێتە ئەستۆیان، دووەمیش بۆ ئەوەی گەلی کوردیش وەکو هەر گەلێکی تر داکۆکی لە بوونی خۆی بکات و بەئاشتی و هێمنی لەسەر خاکی خۆی بژی تا پەرە بە ژیانی سیاسی، کەلتووری، ئابووری و کۆمەڵایەتی خۆی بدات و بەشدار بێت لە پرۆسەی ئاشتی و ئاسایشی ناوچەکە و جیهاندا. بەڕاستی ئەو بێ دەنگییەی لە تاوانی جینۆسایدی گەلی کورد دەکرێت، ژیان و بوونی کوردی خستووەتە مەترسییەوە. ئێمە بە هەستکردنێکی زۆرەوە بەو مەترسییە ەلای خۆمانەوە زۆرمان مەبەست بووە لەم باسە بکۆڵینەوەو لەڕوانگەیەکی انستییەوە پشت بە یاسای نێودەوڵەتان ببەستین کە دەکرێ وەکو چەکێکی اریگەر و ڕەوا بەکاری بهێنین. جێگەی داخە نە بزووتنەوەی ئازادیخوازیمان

و نه ڕۆشنبیرانمان گرنگیی زۆریان بەو بوارە نەداوە.

چارەسەرکردنی تاوانی جینۆسایدیش، تەنیا لە چوارچێوەی یاسای تازەی نێودەوڵەتاندا دەکرێ ئەنجام بدرێ و ئەو تاوانەی لەگەلی کورد دەکرێ، یەکەم کورد خۆی لێ بپارێزێ دووەمیش ئەو مەترسییە بەربەند بکرێ و لابدرێ کە هەڕەشە لە مرۆڤایەتی دەکات. دیارە فەوتاندنی هەر کۆمەڵە مرۆڤێک، چ کۆمەڵێکی نەتەوەیی یا ئاینی یا ئەتنیکی، فەوتاندنی بەشێکە لە مرۆڤایەتی، بۆیە ئەم تاوانە وەکو تاوانێک لە دژی مرۆڤایەتی دەژمێردرێ و بە دڕندەترین تاوان لەیاسای تازەی نێودەوڵەتاندا دیاریکراوە.

لەم باسەماندا، ئێمە پشتمان بەگەلێ سەرچاوەی زانستی، یاساناسان و زانایان بەستووە، تابتوانین لەبەر ڕۆشنایی یاسای تازەی نێودەوڵەتاندا، لەم تاوانە بکۆڵینەوە. هەروەها پشتمان بەکۆمەڵێ بەڵگەنامەی جیهانی بەستووە بۆ ئەوەی زیاتر باسەکە دەوڵەمەند بکرێ و چاکتریش پشت بەڕاستی و دروستی ئەو بەڵگەنامانە ببەسترێ. ئەمە جگە لەوەی گەلێ لەو ڕووداوانەی کوردستان لە چاپکراو و ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی لایەنەکانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد تۆمار کراون، بۆیە ئەو سەرچاوانەمان بەسوودێکی زۆرەوە بەکارهێناوە.

لە ڕاستیدا، لە نووسینی ئەم باسەدا گەلێ گیروگرفتمان هاتووەتە ڕێ. چونکە باسی یاسایی لە بواری ڕۆشنبیریی کوردیدا زۆر کەمە و گەلێ ڕستەو زاراوەی یاسایی کە پێشتر لە زمانی کوردیدا بەکار نەهێنراون، هەوڵمان داوە بەگوێرەی توانا بەزمانێکی لەبار بیان نووسین تاکو مانای دیاری بدەین بەدەستەوە. لەلایەکی تریشەوە گەلی بڵاوکراوەی کوردی کەزانیارییان تێدا بڵاوکراوەتەوە، بەتایبەتی دەربارەی قڕکردن و وێرانکردنی کوردستان، هیچ ژمارە و مێژوو و شوێنی چاپکردنیان لەسەر نەبووە، نەمانتوانیوە بەکاریان بێنین.

بۆ زیاتر تێگەیشتن و مەبەستی تەواویش، ئەم لێکۆڵینەوەمان کردووە بە سێ بەشەوە:

بەشی یەکەم: چەمکی جینۆساید وەکو تاوانێکی دڕندانە لەدژی مرۆڤایەتی.

بەشی دووەم: فاکتی جینۆساید لە سەرانسەری کوردستاندا.

بەشی سێیەم: مافی گەلی کورد لە داکۆکی نێونەتەوەیی لە دژی تاوانی جینۆساید.

سەرنج: ئەم لێکۆڵینەوەیە، لە بنەڕەتدا نامەی ماستەر بوو، ساڵی ۱۹۹۰ لە کۆلێژی یاسای نێودەوڵەتان لە زانکۆی کییف- ئۆکراینا پێشکەش کرا، پاشتر هەندێ دەسکاریم کردووەو گەلێ سەرچاوەی ترم بۆ زیاد کردووە.

مارتی ۱۹۹۵

ئۆکراین-کییف

## چەمکی جینۆساید

## وەکو تاوانێکی دڕندانە لەدژی مرۆڤایەتی

(Genocide) جینۆساید لەڕووی زمانەوە لە دوو وشە پێکهاتووە:

١- وشەیەکی گریکی Genos واتە: ڕەگەز، بنەچە.

٢- وشەیەکی لاتینی Caeder واتە: کوشتن، فەوتاندن.

بەلێکدانی هەردوو وشەکە (فەوتاندنی بنەچە) (Genocide) پێک دێت[١].
لەبەرئەوەی ئەم تاوانە پێشێل کردنێکی تەواوی مافی مرۆڤە، بەتایبەتیش زۆر ترسناکانە لەدژی مافی ژیانە و تێکدەری ئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەییە، بۆیە، بڕیاری ئەوەی لەسەر دراوە کە تاوانێکی دڕندانەیە لەدژی مرۆڤایەتی. تاوانی دژی مرۆڤایەتیش هاوشانی تاوانی جەنگ و تاوانی دژی ئاشتی، بە تاوانی نێونەتەوەیی دەژمێردرێن. بۆیە لەیاسای تازەی نێودەوڵەتاندا زۆر بەگرنگی جەخت لەسەر قەدەغەکردن و سزاخستنە سەر تاوانکارانی کراوە. لەدوای جەنگی دووەمەوە، بەهۆی تاوانی فاشیستەکانەوە، لەیاسای تازەی نێودەوڵەتاندا ئەو پرنسیپە بەتەواوی جێگیر بوو کە، جینۆساید تاوانێکی دڕندانەیە لەدژی مرۆڤایەتی، بۆیە نەک هەر وڵاتانی تاوانکار بەڵکو ئەو کەسانەش کە بەئەنجامدانی جینۆساید تاوانبار دەکرێن، لێپرسینەوەی یاسایی-نێونەتەوەیی دەکەوێتە ئەستۆیان[٢].

کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، پشت بە بەندی شەشەمی (٦) دەستووری دادگای نورنبێرگ دەبەستێ، کە (جینۆساید، واتە ڕەتکردنەوەی مافی بوونی سەرجەمی کۆمەڵەی مرۆڤایەتی، هەروەکو چۆن، فەوتاندنی مرۆڤ نیشانەی ڕەتکردنەوەی مافی بوونی ژیانە، ئەوەش

ڕەفزکردنەوەی دان پێدانانە بەمافی بوون، سووکایەتی کردنە بە سەرجەمی مرۆڤایەتی و ژیانێکی قەرەبۆ نەبۆوە دروست دەکات. سەرجەمی کولتووری شارستانی کۆمەڵی مرۆڤ دادەماڵی و دژی یاسای ڕەوشت و ناوەڕۆک و مەبەستی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕادەوەستی)[٣].

پاشتریش پەیماننامەی قەدەغەکردنی تاوانی جینۆساید و سزا خستنە سەر تاوانکارانی لە ١٩٤٨/١٢/٩ دا لەرێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان (ر. ن. ی) تایبەت کرا بەو تاوانە نێونەتەوەییەوە. پرۆسەی دانانی ئەو بەڵگەنامە جیهانییە لە گەلێ سەرچاوەدا باس کراوە[٤]. بۆیە ئێمە پشت بە ئەنجامە دروستەکانی ئەو سەرچاوانە دەبەستین تاکو پراکتیکە کردنی جۆرەکانی تاوانی جینۆساید لەدژی گەلی کورد شی بکەینەوە.

شایەنی باسە، کە بنەماکانی مەحکوم کردنی جینۆساید وەکو تاوانێکی درندانە لە دژی مرۆڤایەتی، خەسڵەتێکی بالآیان هەیە (imperative Jus Congens)، هەر بۆیە بەسەر ئەو وڵاتانەشدا دەکرێتە مەرج (دەسەپێنرێ) کە بەشداریش نین لە پەیماننامەی ١٩٤٨ی قەدەغەکردنی جینۆسایدا. لەو بارەیەوە پشتگیریی ڕای یاساناس (یو. ئە. ڕیشیتەف) دەکەین کە پێی وایە بەرهەڵستی کردنی تاوانی جینۆساید لەبنەما باڵاکانی یاسای نێودەوڵەتانەوە سەرچاوە هەڵ دەگرێ، کە مەرجە بۆ هەموو وڵاتێک بەبێ ڕەچاوکردنی بەشداری نەکردنیان لە پەیماننامەی ١٩٤٨دا دەربارەی قەدەغەکردنی جینۆساید و سزا خستنە سەر تاوانکارانی[٥].

هەر لەو بارەیەشەوە دادگای نێودەوڵەتی ڕ. ن. ی لە ١٩٥١/٥/٢٨دا ڕایگەیاند کە (هۆی دانانی ئەو پەیماننامەیە مەبەستی ڕ. ن. ی ە کە جینۆساید مەحکوم بکاو سزای بخاتە سەر وەکو تاوانێک لەیاسای نێودەوڵەتاندا)، ئەم تیۆرەش دەگاتە ئەو ئەنجامەی، کە ئەو پرنسیپانەی پەیمانەکەیان لەسەر بنیات نراوە، بریتین لەو پرنسیپە دان پێدانراوانەی کە میللەتانی پێشکەوتوو دەیکەنە مەرج بەسەر تەنانەت ئەو وڵاتانەشەوە کە پێوەندار نین بە پەیماننامەکەوە[٦].

بەندی ١٩ی پرۆژەی یاسای بەرپرسیارێتی دەوڵەت کە لیژنەی یاسای نێودەوڵەتان لە ڕ. ن. ی دایناوە، ئەوە دیاری دەکات، لەیاسای تازەی نێودەوڵەتاندا، هەر ڕەفتارێکی دەوڵەت کە پابەندێتی نێونەتەوەیی بشکێنی، ئەوە ڕەفتارێکی جیهانی دژ بە یاسایە، ئەم پابەندێتییە نێونەتەوەییەش سەرچاوەکەی لە داب و نەریتەوە یا لەرێکەوتننامەوە بێت، شکاندنی کار ناکاتە سەر بەرپرسیارێتی نێونەتەوەیی کە ڕەفتاری دژ بە یاسای، ئەو دەوڵەتە هێناویەتیە ئاراوە[٧]. کەواتە، ئەو پابەندێتییە نێونەتەوەییەی کە دەوڵەت هەیەتی، ئەگەر سەرچاوەکەی لە داب و نەریتی نێودەوڵەتییەوە بێت، یا لەرێکەوتننامەوە، ئەوا شکاندنی دژەکارە لەیاسای نێودەوڵەتاندا، بۆیە لێپرسینەوە لەسەری کارێکی حەتمییە، ئەمەش زیاتر هەمان بیروڕا دەچەسپێنی، کە دەوڵەت بەشداریش نەبێ لەو پەیماننامەی کە تایبەت کراوە بە قەدەغەکردنی جینۆسایدەوە، ئەوا، هەر بەرپرسیارێتی نێونەتەوەیی لەئەستۆدایە و دەبێ پێوەی پابەندبێ.

جینۆساید تەنیا فەوتاندنی فیزیکی کۆمەڵە خەڵکێکی نەتەوەیی، ئێتنیکی، ڕەگەزی یا ئاینی نییە، بەڵکو چەند جۆرێکە:

١- جینۆسایدی فیزیکی (بەدەنی): کوشتن بەهەر جۆرێک بێت[٨]. ئیعدام کردن، گوللەباران کردن، هێرشی سەربازی و بەکۆمەڵ کوشتن و بەکارهێنانی چەکی قڕکردن وەکو کیمیاوی و فۆسفۆڕی و ژەهرو... هتد.

٢- جینۆسایدی بیۆلۆژی: بەربەند کردنی هەر کۆمەڵە مرۆڤێک لە پێشکەوتن و زیادبوون، وەکو بەربەندکردنی منداڵ بوون و زیادکردن، یا لەیەک دابڕینی پیاو و ئافرەت و دابەشکردنی کەسانی خێزان بۆ ماوەیەکی زۆر[٩]. ئەم جۆرەی جینۆساید لەهێرشە شوومەکانی(ئەنفال)ی ١٩٨٨ لە خوارووی کوردستاندا پێڕەوکراوە بەتایبەتی دابڕینی پیاوان لە ئافرەتان و دابڕینی کچان لە دایکان و باوکان، دوایش منداڵان لە دایکان.

٣- جینۆسایدی کەلتووری- نەتەوەیی: وەکو قەدەغە کردنی زمان و ڕۆشنبیری و شێواندنی مێژوو. فەوتاندنی تایبەتمەندی نەتەوەیی و

نەهێشتنی یەکێتی هاوبەشی نێوان خەڵک[١٠]. هەروەها وێرانکردنی شوێنەواره دێرینەکان وەکو ڕووخاندنی پەیکەر و نەشکەوت و مۆزەو گەرەک و گەرما و و بازاڕو مزگەوت و کڵێسەو هەموو شوێنەوارێک کە پاشماوەی کۆن یا نوێ بێت و بەرهەمی جۆری ژیانی ئەو خەڵکە بێت.

٤- جینۆسایدی ئابووری: ئەمە دەکرێ پێی بوترێ (ویرانکردنی ئابووری)، واتە وێرانکردنی سامان و سروشت و بەروبوومی ناوچەکان، تاڵان کردن و فەرهوودکردنی ماڵ و سامانی خەڵکی. هەر لە شتوومەکی ناوماڵ، قاپی و پەنجەرەوە تا مەڕ و ماڵات و کەرەسەکانی ژیان. هەروەها گەمارۆی ئابووری بە مەبەستی برسیکردنی خەڵک. ئەمانە هەموویان دەبنە هۆی فەوتاندنێکی لەسەرخۆی مرۆڤ، جگە لەوەی ڕێژەی مردن بەهۆی نەبوونی خۆراکی پێویست و داوو دەرمان و زیادبوونی نەخۆشییەوە زیاد دەکات، دەبێتە هۆی کۆچکردنێکی بەردەوامیش کە ئەنجامەکەی چۆڵکردنی جێگەی دێرین و ڕەسەنی خەڵکەکەیە، ئەویش زۆر جار دەبێتە هۆی پەرتەوازەکردن و لەدەست دانی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی و فەوتاندنی کەلتووری نەتەوەیی. بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی و گازی ژەهراوی سەرباری ئەوەی قڕ دەخاتە مرۆڤ و هەموو زیندەوەرێک، دەبێتە هۆی مردنێکی ئابووری سەراپاگیری. جا وێرانکردنی ناوچەکان و وێرانکردنی ئابووری، هەردووکیان تاوانێکی دیکەیان لێ بەئەنجام دێ، ئەویش تاوانی (Ecocide- ئیکۆسایدـ)ـە، واتە وێرانکردنی ئیکۆلۆژیا. کە ئەنجامەکەی بەجینۆسایدێکی گشتی دەشکێتەوە، ئەویش بە وێرانکردن و لەوتاندنی ژینگە ناسراوە. ئەم تاوانە خۆی تاوانێکی نێونەتەوەییی سەربەخۆیەو لەیاسای تازەی نێودەوڵەتاندا زۆر گرنگی پێ دراوە.

پەیماننامەی ساڵی ١٩٧٧ تایبەت کراوە بە قەدەغەکردنی ئامرازی جەنگ و ئەو ئامرازانەی کە زیان بەسروشت دەگەیێنن، کە تاوانی لەوتاندنی ژینگە بە تاوانێکی نێونەتەوەیی دیاری دەکات. دیارە لەوتاندنی ژینگەش دەبێتە هۆی فەوتاندنێکی لەسەرخۆی مرۆڤ.

چونکه شێواندنی ژینگە دەبێتە هۆی (Biocide- بیۆساید) واتە: (فەوتاندنی ژیان)، ئەمەش کاردەکاتە سەر نەک هەر بوونی مرۆڤ و ژیانی لەو ناوچانەدا[١١]، بەڵکو بوونی هەموو گیان- لەبەرێک و چۆنێتی شێوەی ئاسایی سروشتیش.

بۆیە، جینۆساید لە یاسای تازەی نێودەوڵەتاندا وەکو تاوانێکی سەربەخۆ کە تایبەتمەندی جیاوازی هەیە لەگەڵ تاوانی دیکەدا دیاری کراوە، هەر بۆیەش لە تاوانی جینۆسایدا دوو پێکهاتە زۆر گرنگن، کە دەبێ لەڕووی مەبەست و ژمارەی قوربانییەوە سەیر بکرێ:

١- مەبەست: ئەم تاوانە جیاوازە لە تاوانی دیکە، چونکە مەبەستی سەرەکی جینۆساید فەوتاندنی بەشێک یا سەرجەمی کۆمەڵە مرۆڤێکە. جا بوونی مەبەستی نەهێشتنی کۆمەڵە مرۆڤێک، چ بەشێکی یا سەرجەمی، خەسڵەتێکی تایبەتی بە جینۆساید دەداو لەتاوانی تری جیا دەکاتەوە.

٢- ژمارەی قوربانی: لەبەر ئەوەی لە جینۆسایدا، مەبەست فەوتاندنە، بۆیە ژمارەی قوربانی لەبەرچاو ناگیرێ[١٢]. کەواتە، هەر بەبوونی پێشنیاز لە فەوتاندنی هەر کۆمەڵە مرۆڤێک بێت، ئیتر مەبەستەکە لەئارادایە، ئەنجامدانی تاوانەکەش مەرج نییە قوربانی زۆری هەبێ. کەم و زۆر گرنگ نییە و لەبەرچاو ناگیرێ بۆ دیاریکردنی تاوانی جینۆساید و تاوانکارانی.

پەیماننامەی ١٩٤٨ دەربارەی قەدەغەکردنی تاوانی جینۆساید و سزا خستنە سەر تاوانکارانی، لە بەندی یەکەمیدا ئەوە دیاری دەکات کە وڵاتانی بەشداری ئەو پەیماننامەیە لەسەریانە ڕێگە لەو تاوانە بگرن و سزا بخەنە سەر تاوانکارانی، چونکە جینۆساید بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتان پێشێل دەکات. ئەوەی زۆر گرنگیشە ئەوەیە کە ئەو پەیماننامەیە لە سەردەمی ئاشتی و جەنگیشدا لە کاردایە، هەروەکو بەندی یەکەمی جەختی لەسەر دەکات[١٣]. کەواتە تاوانی جینۆساید خۆی نەک هەر لە سەردەمی شەڕدا بەڵکو لە سەردەمی ئاشتیشدا ئەنجام دەدرێ. ئەمەش لە زانستی یاسای نێودەوڵەتاندا بەگشتی دانی پێدانراوە[١٤].

بەندی دووەمی پەیماننامەی ١٩٤٨ مەبەستی تاوانی جینۆساید دیاری دەکات و دەڵێ: (ئەنجامدانی تاوانکارییە بەمەبەستی سەرلەبەر قڕکردن یا قڕکردنی بەشێکی هەر گروپێکی نەتەوەیی، ئەتنیکی، ڕەگەزی یا ئاینی)[١٥].

کەواتە، وەکو (یو. ئە. ڕیشیتەڤ) دەڵێ: ئەگەر ئەو مەبەستە لەئارادا نەبێ، ئەوا ئەو کردەوەیە خەسڵەتی جینۆسایدی نییە، ئەگەرچی تاوانەکە لەو تاوانانەش بچێت کە لە بەندی دووەمی پەیماننامەی ١٩٤٨دا ژمێردراون، چونکە (جینۆساید، وەکو تاوانێکی یاسایی بەهۆی مەبەستەکەیەوە جیاوازە لە تاوانی دیکەی کوشتن)[١٦]. لێرەدا بۆمان دەرکەوت دەبێ مەبەستی قڕکردنی سەرجەمی یا بەشێکی کۆمەڵە مرۆڤێک هەبێ بۆ ئەوەی بتوانرێ جینۆساید جیا بکرێتەوە لە تاوانی دیکە.

جۆری ئەو تاوانانەش وەکو لە بەندی دووەمی پەیماننامەی ١٩٤٨دا دیاری کراون، ئەم کارانەن:

١- کوشتنی ئەندامانی ئەو کۆمەڵە.

٢- زیان گەیاندن بە لەش و شێواندنی بیری ئەندامانی ئەو کۆمەڵە.

٣- بە ئەنقەست دانانی ئەو کۆمەڵە لەژێر بارودۆخێکی سەختدا ببێتە هۆی فەوتاندنی هەموو یا بەشێکی.

٤- تەگەرە خستنە بەر منداڵ بوون لەنێو ئەو کۆمەڵەدا.

٥- بەزۆر ڕاگواستنی منداڵ لەو کۆمەڵەوە بۆ کۆمەڵێکی تر[١٧].

وڵاتە بەشدارەکانی پەیماننامەی ١٩٤٨، ئەو مەرجەیان خستووەتە ئەستۆی خۆیان و پابەند بوونە کە سزا بخەنە سەر نەک هەر تاوانی ڕاستەوخۆی جینۆساید، بەڵکو وەکو بەندی (٣)ی پەیماننامەکە دەڵێ:

١- جینۆساید.

٢- پیلان گێڕان بە مەبەستی جینۆساید.

٣- هاندانی ڕاستەوخۆ و ئاشکرا بە مەبەستی جینۆساید.

٤- هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی جینۆساید.

٥- بەشداری کردن لەجینۆسایددا[١٨].

کەواتە، تاوانکاریی تاوانی جینۆساید، هەر ئەوە نییە ڕاستەوخۆ جینۆساید ئەنجام بدرێ، بەڵکو هەر یەکێک لەو کارانەی بەندی (٣)ی پەیماننامەکە ئەنجام بدرێ ئەوا ئەنجامدەر بەرپرسیارە بەرامبەر تاوانی جینۆساید.

بەندی چوارەمی هەمان پەیماننامە، سزا دەخاتە سەر کەسانی دیاریکراوی تاوانی جینۆساید، هەروەها ئەوە دیاری دەکات، ئەو کەسانە ئەگەر وەزیفە ئەنجام بدەن، یاخۆیان سەربەخۆ ئەو تاوانە بکەن. ئەو تاوانەش پەیوەند نییە بەوەی لەدەستوور و یاسای ناوخۆی وڵاتەکەدا لێپرسینەوە بخاتە سەر ئەستۆیان یا نەیخات[١٩].

واتە، جینۆساید ئەگەر لە یاسای ناوخۆی هەر وڵاتێکدا قەدەغە کرابێ یا نەکرابێ، مەحاڵە دەربازبێت لە بەرپرسیاریتی نێونەتەوەیی، چونکە ئەو تاوانە بەگوێرەی یاسای نێودەوڵەتان و لە پراکتیکیشدا ئەوەندە سەختەو دڕندانەیە، لێ خۆشبوونی بۆ نییە.

بەندی شەشەمی پەیماننامەکەی ١٩٤٨ پرنسیپی سزادانی گوناهبارانی ئەنجامدەری تاوانی جینۆساید دەچەسپێنێ کە: (دەبێ بەدادگایەکی ئەو وڵاتەی کە تاوانەکەی لێ ئەنجامدراوە دادگایی بکرێ)[٢٠]. ئێمە پشتگیری بیروڕای گەلێ لە شارەزایان دەکەین، کە پێیان وایە، بۆ بەربەندکردنی کاریگەرانە، نابێ پشت بەدادگای هەمان وڵات ببەسترێ کە تاوانی جینۆسایدی لێ ئەنجام دراوە، لەبەرئەوەی ڕەنگە وڵاتەکە خۆی گوناهبار بێت بە ئەنجامدانی ئەو تاوانە، بۆیە پێویستە دادگایەکی تایبەتکاری نێونەتەوەیی سازبدرێ. سازنەدانی دادگایەکی لەو جۆرەش دەبێتە هۆی سزانەدانی تاوانکارانی جینۆساید[٢١]. ئەم کێشەیەش لەکاتی دانانی پەیماننامەی ١٩٤٨دا بۆ قەدەغەکردنی جینۆساید، لەلایەن کۆمیتەی شەشەمی کۆمەڵەی گشتی ڕ. ن. ی ـەوە لێی کۆڵراوەتەوە. ئەنجامیش وا چارەسەر کرا وەکو لە بەندی شەشەمی پەیماننامەکەدا دیاری کراوە، کە تاوانبارانی جینۆساید لەلایەن دادگایەکی ئەو وڵاتەی کە جینۆسایدی لێ ئەنجامدراوە یا لەلایەن

دادگـایەکی یاسـایی (جنائی) نێـونەتـەوەییـیـەوە سـزا بدرێن. دەبێ لەلایەن بەشدارانی پەیماننامەکەوە هاوکاری ئەو دادگایە بکرێ[٢٢].

ئەگـەرچـی پەیماننـامـەی ١٩٤٨ دەربارەی قـەدەغـەکـردنی جـینۆسـاید و سزاخستنە سەر تاوانکارانی لە ساڵی ١٩٥١ـەوە کەوتووەتە کار، بەڵام تاکو ئێستا دادگایەکی لەو جۆرە تایبەت بە تاوانی نێونەتەوەیی وەکو جینۆساید دانەنراوەو گـەلێ لە تـاوانکارانـی جـینۆسـاید کـە بەفـەرمـانـی وڵاتـەکـەیان ئەنجامیان داوە، لێیان نەپرسراوەتەوە.

وەکو بۆمـان ڕوون بووەوە، جینۆساید تاوانێکی دڕندانەیە لەدژی مـرۆڤایەتی و پرنسیپە سـەرەکییەکانی یاسـای نێودەوڵەتان پێشێل دەکات و هەڕەشـە لە ئاشـتـی و ئـاسـایشی نێـونەتەوەیی دەکـات. ئـەو چارەسـەرانەش کـە لە پەیماننامـەی ١٩٤٨دا دانراون لەدژی جینۆساید، هـەتاکو ئێستا بە بێهێزی مـاونەتەوە، بۆیە پێویسـتـە بنەمـای نێونەتەوەیی دیکە بهێنرێتە کایەوە لەدژی جینۆساید.

## پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

١- کورتەی فەرهەنگی سیاسی. کۆمەڵ زانا. مۆسکۆ-١٩٨٩، چ ٦ ل . ١١٠
٢- فـەرهەنگی دیبلۆمـاسی، ٣ بـەرگ. چاپی چوارەم. بەرگی ١مـۆسکۆ- ١٩٨٤ ل ٢٥١(بە زمانی ڕووسی).
٣- بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ڕ. ن. ی ٩٦/١ لە ١٩٤٦/١٢/١١دا.
٤- ئەندریوخین م. ن : جـینۆسـاید-دڕندانەترین تاوان لەدژی مـرۆڤایـەتی. مـۆسکۆ ١٩٦١، هەروەها ئەندریوخین: جینۆساید لەسیاسەتی وڵاتە ئیمپریالییەکاندا. مـۆسکۆ ١٩٦٧، هەروەها: ڕیشـیـتـەف یو. ئە: بەرهەڵسـتی کـردنی تـاوانی نێونەتەوەیی دژ بە ئاشتی و ئاسایش. مۆسکۆ . ١٩٨٣ (بە زمانی ڕووسی).
٥- ڕیشیتەف یو. ئە: هەمان سەرچاوە ل . ١٠٤
6- International Court of Justice Report 1951. P.16
٧- زنجیرەی یاسای نێودەوڵەتان/بە سەرپەرشتی: ن. ئە. ئۆشاکەف/٧ بەرگ. ب. ٣ مۆسکۆ ١٩٩٠ ل ٢٢١ (بە زمانی ڕووسی).

٨- گوبین. ڤ. ف. : جیاوازی ڕەگەز-ناوەڕۆکی کۆنەپەرستانەو دژە کاری یاسای نێونەتەوەیی. مۆسکۆ ١٩٧٩ ل٥٠-٥١(بە زمانی ڕووسی).

٩- ئەندریوخین: جینۆساید- دڕندانەترین تاوان لەدژی مرۆڤایەتی ل ٨.

١٠- ئەندریۆخین: جینۆساید لە سیاسەتی وڵاتە ئیمپریالییەکاندا ل ٥- ٦.

١١- کەرپێتس ی. ی: تاوانی خەسڵەت نێوتەوەیی. مۆسکۆ ١٩٧٩ ل٢٤(بە زمانی ڕووسی).

١٢- ساڵنامەی لیژنەی یاسای نێودەوڵەتان ١٩٨٦، بەرگی ٢ بەشی ١. ڕ. ن. ی. نیویۆرک ١٩٨٩ ل ٦٧ (بەزمانی ڕووسی).

١٣- بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ڕ. ن. ێ. ٣/ ٢٦٠ لە ١٩٤٨/١٢/٩دا.

١٤- ئەندریوخین: جینۆساید-دڕندەترین تاوان لەدژی مرۆڤایەتی. ل٨. هەروەها: ڕیشیتەف: هـ. س. ل١٠٢.

١٥- یاسای نێودەوڵەتان لە بەڵگەنامەکاندا. مۆسکۆ ١٩٨٢ ل ٣٣٢(بەزمانی ڕووسی).

١٦- ڕیشیتەف: هـ. س. ل١٠٣.

١٧، ١٨، ١٩ و ٢٠: یاسای نێودەوڵەتان لە بەڵگەناماندا ل٣٣٢.

٢١- بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ڕ. ن. ی. ٣/ ٢٦٠.

٢٢- یاسای نێودەوڵەتان لە بەڵگەناماندا ل ٣٣٢

## سیاسەتی جینۆساید لە سەرانسەری کوردستاندا

لە چوارچێوەی وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستانداعێراق، ئێران، تورکیا و سوریا، مەسەلەی کورد هەتا ئێستا چارەسەر نەکراوە و گەلی کورد بە دابەشکراوی بەر شاڵاوی دڕندانەی قڕکردنێکی سەراپاگیری کەوتووە. ئیتر بوونی نەتەوەیی کورد کەوتووەتە مەترسیەوە و مێژوو و کەلتوور و ئابووری کوردستان وا شێوێندراوە، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تایبەتمەندیی زیاتر تێک دەچێ و قڕکردنێکی فیزیکییش گەلی کوردی گرتووەتەوە، هەر بۆیە جەوهەری بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوایەتی گەلی کورد، خەسڵەتێکی ڕەوای هەیە، چونکە داکۆکی لە مافی ڕەوای گەلەکەی خۆی دەکات.

چارەسەر نەکردنی مەسەلەی کورد، گەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی کە خاکی کوردستان لەڕووی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە لەژێر چەوساندنەوەیەکی کۆلۆنیالیانەدا لە ئاستێکی زۆر نزمدایە، ئەوەش نێگەتیڤانە کاردەکاتە سەر پرۆسەی یەکێتی نەتەوەیی گەلی کورد و کاریگەرێتی خەباتی سیاسی لەپێناوی مافە نەتەوەییەکاندا[1]. ئیتر بەردەوامبوونی ئەو سیاسەتەش گەیشتووەتە ئەوەی کە جینۆسایدێکی هەمەلایەنی بەرنامە ڕێژ کراوە لەلایەن ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە جێبەجێ دەکرێ، هەر بۆیەش بوونی گەلی کورد وەکو نەتەوە لەمەترسیدایە. بەبیروڕای زانای کۆمەڵناسی تورک ئیسمایل بیشکچی وەکو لە کتێبی (کوردستان: کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی)دا ڕوونی کردووەتەوە: (کە کەسایەتی کوردستان تەنانەت لە کەسایەتی و ئاستی کۆلۆنییەک نزمترە، کەسایەتی و ئاستی نەتەوەیی کوردیش لە کەسایەتی و ئاستی نەتەوەیەکی(بەکۆلۆنیکراو) کەمترە[2].

سیاسەتی ئەو وڵاتانە، بریتییە لە وێرانکردنی شارستانییەت و کەلتووری

کورد، هەوڵێکی زۆر دەدەن ئەو ڕاستییە بشارنەوە کە گەلی کورد لە گەلە هەرە دێرینەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، نەک هەر ڕێگە بۆ پێشکەوتنی کەلتووری کوردی خۆش ناکەن، بەڵکو وەکو د. جەلیلی جەلیل دەڵێ: (گەلی ئێمە، سەدان ساڵە لەمافی خۆی بێ بەری کراوەو ئەو وڵاتانەی کە ئێمە کەوتووینەتە ژێر دەسەڵاتیانەوە ڕێگەیان بە پێشکەوتنی کەلتووری کوردی نەداوەو بەربەرەکانیشیان کردووەو گەلێک لەمێژوو و فۆلکلۆریشمانیان دزیوە)[٣].

نەهێشتنی کەلتوور، ڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی فەوتاندنی یەکێتی و بوونی نەتەوەیی هەر گەلێک یا هەر کۆمەڵە مرۆڤێک. لەڕووی فەلسەفیشەوە، (بەهەموو مانایەک، لەهەر جێگەیەک کەلتوور نەبێ، کۆمەڵیش نییە) هەر بۆیەش، (بوونی کەلتوور، کۆمەڵی مرۆڤ لە کۆمەڵی ئاژەڵ جیا دەکاتەوە)[٤]. بۆ تێگەیشتنێکی تەواوی سیاسەتی فەوتاندنی گەلی کورد کە هەموو لایەنێکی گرتووەتەوە، دەبێ ئاگاداری فاکتی پراکتیک کردنی تاوانی جینۆساید ببین لە سەرانسەری کوردستاندا. ئەم بەشەی باسەکەشمان خستنە ڕووی جۆری ئەو تاوانانەیە لەڕووی مێژووییەوە، تابتوانین لەسەر ئەو بناغەیە بگەینە ئەو ئەنجامەی کە جینۆساید بە هەموو جۆرەکانییەوە لەدژی گەلی کورد پراکتیک دەکرێ.

## فاكتی تاوانی جینۆساید له باشووری كوردستان

هەر لەدروستبوونی دەوڵەتی عێراقەوە/ لە ساڵی ١٩٢١/، پاش لکاندنی خوارووی کوردستان پێوەی، کێشەی کورد بەردەوام کێشەی سەرەکی عێراق بووە. ڕژێمە یەک لەدوای یەکەکانی عێراق نکوولییان لە مافی گەلی کورد لە دیاریکردنی چارەنووسدا کردووەو سیاسەتی دژ بە مەسەلەی نەتەوایەتی گەلی کورد بەرنامەڕێژکراوە، هەر بۆ جێبەجێ کردنی ئەو سیاسەتەش ئەندازەی تاوانی ئەو ڕژێمانە گەیشتووەتە پلەیەکی بەرزو لە هیچ ڕوویەکیشەوە سڵ نەکراوەتەوە. بۆیە کە بەوردی سەیری جۆری ئەو تاوانانە دەکەین، پێکهاتەی تاوانی جینۆساید بە تەواوی دیارە. لێرەدا هەوڵ دەدەین تابلۆیەکی دیاری ئەو تاوانانە بخەینە ڕوو. ئەوەی ئێمەش توانیومانە بەدەستی بهێنین، هەموو ئەو تاوانانە نین کە لەدژی گەلی کورد لەچوارچێوەی عێراقدا ئەنجام دراون، بەڵام هەوڵمان داوە، تائەندازەیەک ڕووداوە سەرەکییە دیارەکان باس بکەین.

له١٩٢٣-١٩٢٤ بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی بارزان، هێزی سوپای عێراق و بەریتانیا کەوتنە هێرش و وێرانکردن. تەنیا لە ناوچەکانی بەرۆژ، مزووری و شێروان ٧٩ گوند وێران کران، لە سەرجەمی ٢٣٨٢ خانووبەرە ١٣٦٥ خانوویان سووتاند و ڕووخاند، واتە ٦٠٪ی وێران کرا[٥].

هاوینی ١٩٦١، ڕژێمی عبدالکریم قاسم، هێرشی کردە سەر کوردستان و نیوەی زیاتری سوپای عێراقی بەهێرش لەدوای هێرش بەردایە سەر دانیشتوان، تا لەماوەی ساڵ و نیوێکدا نزیکەی (٣٠٠٠) سێ هەزار کەس کوژران، کە زۆربەیان خەڵکی مەدەنی بوون. زیاتر لە (١٠٠,٠٠٠) سەد هەزار ئاوارە بوون و کەوتنە چیا، (١٥٠) سەد و پەنجا گوند و شار وێران کران[٦].

١٩٦٣/٦/١١ دیسانەوە شەڕ هەڵگیرسایەوەو لە مانگی یەکەمی هێرشدا نزیکە (٢٠٠) دووسەد گوند سووتێنران و زیاتر لە(٢٠٠٠) دووهەزار کەسیش کوژران[٧]. لە مانگی ١٩٦٣/٧دا وەفدی یەکێتی سۆڤێت لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕ. ن. ی. ڕایگەیاند کە شەڕی ڕژێمی عێراق لەدژی کورد، شەڕی جینۆسایدە. لە(١٨) هەژدە ئەندامی لیژنەی ئابووری و کۆمەڵایەتی ڕ. ن. ی. تەنها چیکۆسلۆڤاکیا پشتگیری ئەو هەڵوێستەی کرد کە حکوومەتی عێراق مەحکوم بکرێ، هەروەها حکوومەتی مەنگۆلیاش لە مانگی ١٩٦٣/٧دا داوای لە ڕ. ن. ی. کرد مەسەلەی سیاسەتی جینۆساید کە عێراق ئەنجامی دەدات لەدژی کورد، لەلایەن ئەنجومەنی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە لێی بکۆڵدرێتەوە[٨]. بەڵام پاشتر سۆڤیەت لە داواکەی کشایەوە.

١٩٦٣/٧/٩، ڕژێمی عێراق قەدەغەکردنی هاتوچۆی جاڕدا و کەوتە ڕەشبگیرکردنی خەڵکەکە، بەسەدان کەس لە هەموو تەمەن و چین و توێژێک دەسگیرکران، (٨٣) هەشتاو سێ کەس لە پشتی حامیەی سلێمانییەوە گوللەباران کران[٩]. لەو هێرش و پەلامارانەشدا، سوپای عێراق کەوتە گیانی پیاو و ئافرەت و منداڵان و سووکایەتی کردن بەژنان بەبەرچاوی مێردەکانیانەوە کە بەسترابوونەوە. (٥,٠٠٠) پێنج هەزار کەس گیران و (٢٧٦) دووسەد و حەفتاو شەش کوژران و بە بلدۆزەر تەرمەکانیان شاردەوە[١٠]. هاوکات لەشاری کۆیە ڕژێمی عێراق کەوتە گیانی ژن و منداڵ و پیرەمێردی بێ تاوان(٢٠) بیست کەس بە دارتێلەکانەوە بەسترانەوەو گوللەباران کران[١١].

١٩٦٣/٦/١٢ ڕژێمی بەعس بەربووە گیانی خەڵکی گوندەکانی ناوچەی کەندێناوەی سەر بە هەولێر و گوندەکانیان بە مزگەوت و قوتابخانەکانەوە سووتاند و وێران کرد، کۆمەڵێ خەڵک شەهید کران، هاوکاتیش بەعسییەکان کەوتنە تەعریبکردنی ناوچەکە. قۆناغی یەکەم لەحوزەیرانی ١٩٦٣ـەوە دەستی پێکرد، قۆناغی دووەمیش لە ١٩٧٥ـەوە، قۆناغی سێیەمیش لە ١٩٨٧ـەوە، سەرجەم (١٥٢) سەد و پەنجاو سێ گوند تەعریب کران، تەنانەت ناوی

گوندەکانیش کران بە عەرەبی[١٢].

١٩٦٢/٧/١٠ (٤٠,٠٠٠) چل هەزار کوردی دەوروبەری شاری کەرکووک دەربەدەر کران. دانیشتوانی گوندەکانی ئەو مەڵبەندە ڕاگوێزران و عەرەبی خێڵەکییان لە جێگە نان، ماڵە کوردەکان بە بلدۆزەر تەخت کران و خوێندن و نووسین بە کوردی قەدەغە کران و کەوتنە تەعریب کردنی ناوە کوردییەکان و تالانکردنی سەروەت و سامان و باخ و سووتاندنی بێستانی خەڵکەکە[١٣]. لەئەنجامی هێرشی سوپای عێراقەوە بۆ سەر کوردستان لە ١٩٦٣/٦/١١ـەوە تا ١٩٦٣/٧/٢٣ سەرجەم (٨٧٥) هەشت سەد و حەفتاو پێنج گوند وێران کراون[١٤].

ڕۆژنامەنووسی فەرەنسی ڕینییە مۆریس ڕوونی کردووەتەوە کە ساڵی ١٩٦٥-١٩٦٦ ڕژێمی عێراق گازی ژەهراوی لە کوردستان بەکارهێناوە[١٥]. کۆمەڵەی نێودەوڵەتی لە لەندەن کە تایبەتە بەداکۆکی کردن لە مافی کەمە نەتەوەییەکان لە جیهاندا، لە ڕاپۆرتی تایبەتی ژمارە(٢٣)دا لە ١٩٨٩دا کە تایبەتە بە سەرانسەری کوردستان، گەلێ فاکتی تاوانی جینۆسایدی تۆمارکردووە، بە تایبەتی لەسەر خوارووی کوردستان نووسیویەتی کە لە ١٩٦٠-١٩٧٠ (٤٠,٠٠٠) چل هەزار ماڵ لە(٧٠٠) حەوت سەد گونددا وێران کراون. ژمارەی ئاوارەبووان گەیشتە (٣٠٠,٠٠٠) سێ سەد هەزار و(٦٠,٠٠٠) شەست هەزار کەسیش کوژراو و بریندارن[١٦]. هەمان ڕاپۆرت ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کە ساڵی ١٩٨٨ لە ئەنجامی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوییەوە خەڵکێکی زۆر کوژران و خەڵکێکی زۆریش ئاوارەی تورکیاو ئێران بوونە[١٧].

چەندین جار وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان لەسەر سەرکوتکردنی بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوەیی گەلی کورد ڕێک کەوتوون و ڕێکەوتننامەی هاوبەشیان هەیە لەو بارەیەوە، ئیتر لە جێبەجێ کردنی ئەو ڕێکەوتننامانەشدا، نەک هەر هێزی چەکداری بزووتنەوەی کوردستان بەرکەوتووە بەڵکو خەڵکی کوردستان بەخۆیان و ماڵیانەوە بوونە قوربانی.

١٩٦٣/٩/٩ یەکێتییەکی سوپایی لە نێوان عێراق و سوریادا پێکهات و ئەنجومەنێکی هاوبەشیان دروست کرد، وەزیری بەرگری عێراق بووە فەرماندەی هێزی هاوبەشی سوریا و عێراق لەدژی بزووتنەوەی کورد لە خوارووی کوردستان. ئیتر سوپای سوریا بەتانک و فڕۆکەی جەنگی و تۆپەوە هاوشانی سوپای عێراق لە ناوچەکانی زاخۆ و دهۆک کەوتە شەڕەوە. حکوومەتی عێراق بەڕەسمی بەشداربوونی سوپای سوریای ڕاگەیاند. سەرۆکی عێراق عبدالسلام عارف، لە دیدەنی هێزەکانی سوریادا لە کوردستان وتی: سەربازەکانی سوریا (ئەرکی پیرۆزی خۆیان جێبەجێ دەکەن)[١٨].

ساڵی ١٩٦٨، هەر لەهاتنە سەر حوکمی بەعسییەکانەوە، تاوانی جینۆساید زیاتر خەسڵەت و جۆرەکانی ئاشکرا بوو. حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی چ لە نووسراو و ئەدەبیاتیدا یا لە پراکتیکدا، کەوتە هێرش_کردنە سەر گەلی کورد. میشێل عەفلەق-ی دامەزرێنەری حیزبی بەعس دەڵێ: (بەدرێژایی چەندین سەدە، کورد، هاونیشتمانی عەرەبی موسڵمان بووە. وەکو عەرەبی موسڵمان هیچ جیاوازیەکیش لەنێوانیاندا نییە) بەگوێرەی ئەو ڕایەی م. عەفلەق کورد عەرەبە، هەر بۆیەش پێی لێ دادەگرێ و دەڵێ: (گەلی کورد بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب[١٩]). ئەم بیروڕایەی م. عەفلەق، جێگیرکردنی ئایدیایەکی شۆڤێنیستانەیە و جەخت لەسەر ئەوە دەکات، کە حیزبی بەعس لە سەرەتاوە، لەڕووی تیۆرییەوە نەخشەی فەوتاندنی نەتەوەیی گەلی کوردی لە پرۆگرامدا هەبووە، هەر بۆیەش لەپراکتیکدا هەموو هەوڵێکی داوە کە کورد وەکو نەتەوەیەکی سەربەخۆ نەمێنێ و کوردستان لە کورد دابڕێ و بیکاتە نشینگەی عەرەب.

لە مانگی ئابی ١٩٦٩دا، سوپای عێراق هێرشی کردە سەر ناوچەی ئاکرێ، لەو هێرشەدا گوندی (دەکا)و (خورت) تالان کران و سووتێنران، خەڵکی ئەو دوو گوندە خۆیان لەئەشکەوتێکدا حەشاردابوو، ئاگریان تێبەردان و (٦٧) شەست و حەوت ژن و منداڵ سووتێنران[٢٠].

١٩٦٩/٩/١٦ سوپای عێراق هێرشی کرده سەر گوندی (صوریا) لە سێگۆشەی سنووری تورکیا-عێراق-سوریاو (٦٠) شەست کەسیان گوللەباران کرد[٢١].

لە سەرەتای حەفتاکانەوە، ڕژێمی عێراق بە پلان و بەرنامە کەوتە دەرکردنی خەڵکی کوردستان و ئاوارەکردنیان:

١- دەرکردنی فەیلییەکان، لە ١٩٧١-١٩٧٢، (٤٠,٠٠٠) چل هەزار کوردی فەیلی ناسنامەی هاونیشتمانی عێراقییان لێ سەندرایەوەو ڕەوانەی ئێران کران[٢٢]. ژمارەی دەرکراوەکان تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٠ گەیشتە (٢١٥,٠٠٠) دووسەد و پانزە هەزار کەس[٢٣]. پێویستە ئەوەش بڵێین کە ماڵ و سامانی زۆریان ڕژێمی عێراق دەستی بەسەردا گرت بەبێ هیچ پێویستییەکی ژیان دەربەدەرکران.

٢- ڕژێم بڕیاری دەرکردنی (٣٠,٠٠٠) سی هەزار کوردی گۆیان و ئۆمەریان-ی دەرکرد کە لە ناوچەکانی موسڵ دەژیان، تا بەرەو سنوورەکانی تورکیا ڕاگوێزرێن[٢٤]. ئەم بڕیارە ئەگەر جێبەجێش نەکرابێ، هیچ لە مەبەستی جینۆساید ناگۆڕێ.

٣- هەزاران کرێکار و فەرمانبەر و خێزانەکانیان لە کەرکووک و خانەقین دەرکران.

ئەگەرچی ئەو سەردەمە، کاتی ئاشتی و بلاوکردنەوەی بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ بوو، بەڵام هاوکات تەعریب و ڕاگواستن و کوشتن و بڕین بەردەوام بوو.

ساڵی ١٩٧٤، دیسانەوە هێرشی سوپای عێراق دەستی پێ کردەوەو ڕژێم کەوتەوە ئاگرباران کردن و وێرانکردنی کوردستان، بەهەزاران کەس لە خەڵکی شار و دێهاتەکانی کوردستان بوونە قوربانی، ساڵی ١٩٧٥ لەدوای هەرەسهێنانی بزووتنەوەی کوردی، بە کۆمەڵ ڕاگواستنی خەڵکی کوردستان بەرەو خوارووی عێراق دەستی پێ کرد، (٢٠,٠٠٠) بیست هەزار کورد بە زیل

و لۆری ڕەوانەکران، هەر وەکو لە مانگی ١١ی ١٩٧٥دا کۆمەڵەی پشتگیری کردنی گەلانی چەوساوە لەئەڵمانیا-گویتنگن، لەگەڵ کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە هۆڵەندە ڕایان گەیاند ژمارەی ڕاگوێزراوان گەیشتووەتە(٢٠٠،٠٠٠) دووسەد هەزار کەس و (١١٦) سەد و شانزە گوند وێران کراون، (٢٥،٠٠٠) بیست و پێنج هەزار کوردی یەزیدیش لە سنجار ڕاگوێزراون[٢٥]. ساڵی ١٩٧٦ دەزگاکانی ڕژێمی عێراق کەوتنە دەرهاویشتن و سووتاندنی ئەو کتێبانەی کە لە مێژووی کورد دەدوێن، هەروەها قەدەغەکردنی بابەتی مێژووی کورد لە قوتابخانەکاندا[٢٦]. هاوکات ڕاگواستن و تەعریبکردن بەردەوام بوون تا کۆتایی ساڵی ١٩٧٦، (٣٠٠،٠٠٠) سێ سەد هەزار کەس بەزۆر بەرەو خوارووی عێراق ڕاگوێزراون، تا سەرەتای ١٩٧٩ ژمارەیان گەیشتە(٧٠٠،٠٠٠) حەوت سەد هەزار کەس، ئەو ڕاگواستن و پەلاماردانە (١٢٢٢) هەزار و دووسەد و بیست و دوو گوندی گرتەوە کە لەناوچەکانی دیالە و سلێمانی و هەولێر و کەرکوک و دهۆک و موسڵ چۆڵ کران. سەرباری ئەوەش گوندە سنوورییەکانی عێراق-ئێران، وێران کران[٢٧].

هەر دە ساڵ جارێک ئاماری سەرژمێری گشتی دانیشتوانی عێراق دەکرێ، ساڵی ١٩٧٧، هەر وەکو سەرژمێرەکانی تر بەزۆر کەوتنە بەعەرەب نووسینی خێزانە کوردەکان، بەتایبەتی لە کەرکووک، (ئێمە نووسەری ئەم باسە لەسەر ئەو مەسەلەیە تووشی کێشەو بەرەیەکی زۆر بووین).

بەکارهێنانی چەکی قەدەغەکراو، ئامرازی تازەو بەرپاکردنی شەڕ، بە ئەندازەیەکی زۆر بەکارهێنانی بۆمبای ناپاڵمی هەمە چەشنە، ئاو ژەهراویکردن، تەنانەت بەکارهێنانی بۆمبای هێشوویی لەدژی خەڵکی دێهاتەکان و تاقیکردنەوەی چەکی مۆدێرنی قڕکەر، ئەمانە زۆر بە بەرنامە و قۆناغ لەدوای قۆناغ لە کوردستاندا بەکارهێنراون.

ساڵی ١٩٨٣ دەزگاکانی ڕژێم (٨٠٠٠) هەشت هەزار پیاوی بارزانییان لە ئۆردوگای زۆرەملێی قوشتەپە دەستگیرکرد و لەخێزان و منداڵەکانیان دابڕین و سەرەونگونیان کردن. ئەم ڕاستییەش لە گەلێ بەڵگەنامەی جیهانیدا تۆمار

و بڵاوکراوەتەوە[٢٨]. هەر لە ساڵی ١٩٨٣، دەزگاکانی ڕژێم لە سلێمانی ئەرشیف و دۆکومێنتەکانی سەردەمی عوسمانی و ئینگلیزو بەڵگەنامەکانی حکوومەتەکەی شێخ مەحموودیان کۆکردەوەو سووتاندیان[٢٩].

قەیسەری نەقیب لە سلێمانی، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا لەلایەن (وەستا حەسەنی فاتمە غەزایی)ـەوە بۆ (شێخ مستەفای نەقیب)ی مامی شێخ مەحموود ئاواکراوەتەوە. بەدیمەن جوانە و، پەنجەرەی گومەزەکانی لە چەشنی چاوی مرۆڤ"چاوی بادەمی"دا کراون و لە نزیک دەمی دووکانەکانەوە هەر دوو کەوانەیەک بوونەتە یەک کەوانە[٣٠]. لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٨٨دا دەزگاکانی ڕژێم قەیسەرییەکەیان سووتاند و ڕیزە دووکانێکیشیان بە دەمیەوە تەخت کرد[٣١].

دیارە، ئەو شوێنەوارە مێژووییانە، لە کەلتووری نەتەوایەتی هەر میللەتێکدا، ڕاددەی پێشکەوتن و شارستانییەتی ئەو میللەتە دیاری دەکەن، بۆیە لەهەر پلەیەکی هونەری و سەنعەتسازیدابن، پێویستە بپارێزرێن. نموونەیەکی تری فەوتاندنی کەلتووری، ڕێگە پێ نەدانی پەیکەرەکەی شێخ مەحموودی حەفید لە سەرەتای حەفتاکاندا، هەروەها ڕووخاندن و وێرانکردنی پەیکەری کاوەی ئاسنگەر لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٨٥دا، هەروەها ڕێگە پێ نەدانی گەلێ کاری هونەری و پەیکەرسازی تر لە کوردستانداو وێرانکردن و فەوتاندنی شوێنەواری مێژوویی و هونەر، بەشێکن لە جینۆسایدی کەلتووری نەتەوەیی. ئەمە ڕژێم خۆی چاک دەزانێ بۆیە هەروا بە توندیش ئاگاداری ئەو لایەنە گرنگەیە تا وێرانیان بکات، بەڵام بەداخەوە لەلایەن ئێمەوە هێشتا مەترسی ئەو کارانە بەچاکی هەستی پێ ناکرێ، کە دەبێتە هۆی نەهێشتنی مێژووی شارستانی و کەلتووری نەتەوەیی، تەنانەت لە هێرشی ١٩٩٦/٨/٣١دا سوپای ڕژێم هەموو کۆمپیوتەرەکانی هەولێری برد و مەڵبەندە کەلتوورییەکانی سووتاند و تاڵان کرد.

لە کۆنفرانسی جیهانی کۆمەڵەی نێونەتەوەیی بەرگریکردن لەزمان و شارستانییەتی ئەو میللەتانەی کە بەر هەڕەشەی فەوتان دەکەون، لە ئیتالیا لە

٢٧-٢٩/ تەمموزی ١٩٨٤دا، بڕیارێک دەرکراوە بۆ داکۆکی کردن لە گەلی کورد کە سیاسەتی چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و فەوتاندنی کەلتوور و داگیرکردنی ئابووری کوردستان لەلایەن ولاتە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە بووە بە هۆی ئاوارەبوونی هەزاران کەس و بەولاتانی دونیادا بلاوبوونەتەوە. بۆیە بڕیاری ئەو کۆنفرانسە پاراستن و داکۆکیکردنە لە داب و نەریت و کەلتووری نەتەوایەتی ئاوارەکانی کوردستان هەروەها بە گوێرەی ڕێکەوتننامەی ئەورووپی کە تایبەتە بە مافی مرۆڤ و بەگوێرەی ڕاگەیاندنی یونسکۆ لە ١٩٧٨/١١/٢٢دا لەدژی جیاوازی ڕەگەز، کۆنفرانس داوا لە ولاتانی ئەورووپا دەکات کە ڕێگە خۆش بکەن بۆ پاراستن و دان پێدانانی کەلتووری نەتەوەیی ئەو ئاوارە کوردانەی لە ولاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوادا دەژین[٣٢].

تاوانی جینۆساید لە خوارووی کوردستاندا، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرفراوانتر دەبوو، بەکۆمەڵ قڕکردنی بەدەنی، بەکۆمەڵ گرتن، بەتایبەتیش ئافرەت و منالّ، هەروەها ڕاگەیاندنی-حالە الطواریء- و کوشتن و گوللەباران کردنی خەڵکی لەناو شەقامەکانی شارەکانداو وێرانکردنی مالّ و دووکان لە شارەکانی کوردستاندا، ئەمانە لەبەرچاوی خەڵکەکە ببوونە کاری ئاسایی ڕۆژانەی ڕژێم.

بەگوێرەی ڕاپۆرتی یەکێک لەو ئەفسەرانەی کە لەزیندانی-ابو غریب- کاردەکەن، بۆ لیژنەی (کاردری) لە لەندەن، دەربارەی چۆنییەتی گوللەبارانکردنی(٥٠٠٠) پێنج هەزار هاوولاتی لە زیندانەکانی ابو غریب_دا، لەناوەڕاستی ئەیلولی ١٩٨٥دا، لە سەعات هەشت و نیوی شەوی ١٢/ ئەیلولی١٩٨٤/دا، صدام حسین بە تەلەفۆن پەیوەندی کردووە بە بەڕێوەبەری زیندانی(الاحکام الخاصة)و وشەی نهێنی (دەست پێ بکە، دەست پێ بکە)ی پێ ڕاگەیاندووە بە حوکمی ئەو دووجار(دەست پێ بکە)یەش فەرمانی گوللەباران کردنی(٥٠٠٠) پێنج هەزار کەس جێگیر کراو جێبەجێ کرا. ئیتر لە بەرەبەیاندا(٥٠٠) پێنج سەد زیندانی بانگ کران و بردیانن بۆ سەربازگەی بسمایای بەتەلدڕ و گەمارۆدراو لەسەر ڕێگای سەلمان پاک و سەدان سەربازی

بێ چەک لەوێ کۆکرانەوە بۆ تەماشاکردنی پرۆسەی گوللەبارانکردنەکە. دە ڕۆژ لەسەر یەک بەم جۆرە، هەر ڕۆژەی(٥٠٠) پێنج سەد کەس گوللەباران کران. پاشتر هەر خێزانێک دەبوایە(٥٠) پەنجا دیناری عێراقی بدا لە بری نرخی ئەو فیشەکانەی کە کوڕەکانیانی پێ گوللەباران کراوە. دەزگاکانی ڕژێم هەڕەشەشیان لەو خێزانانە کرد کە نابێ کۆڕی ماتەمینی ڕێک بخەن و خەڵکی کۆبکەنەوە. ئەو پێنج هەزار کەسەش، بریتی بوون لە هەڵهاتووانی جەنگی عێراق-ئێران و کەسانی سەر بە ئۆپۆزیسیۆن، هەروەها سەدان کوردی سەر بەلایەنە سیاسییەکان، کە هەندێکیان قوتابی بوون لە زانکۆی (صلاح الدین) لە هەولێر[٣٣].

ڕژێمی عێراق، نەک هەر لەناوخۆی عێراقدا، بەڵکو لەدەرەوەی سنووریش، واز لەخەڵک ناهێنێ و درێژە بەسیاسەتی جینۆساید دەدات. ڕۆژی ٦/٩ و ١٩٨٤/٧/١ فڕۆکەکانی ڕژێمی عێراق بە ناپاڵم بۆمبارانی ئۆردوگای پەناهەندەکانی زێوە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان کرد و گەلێ پیر و ئافرەت و مناڵ بەرکەوتن. لە بۆردومانی ڕۆژی ٦/٩ دا(٤٢) چل و دوو کەس کوژران و (٢٣٠) دووسەد و سی کەسیش بریندار بوون، لە بۆردومانی دووەمیشدا(٢) دوو کەس کوژران و(١٤) چواردە کەس بریندار بوون[٣٤].

١٩٨٥/١١/١٠ لە ناوچەی ئامێدی فڕۆکەکانی ڕژێم، بووکۆکەی یاری منداڵانیان (کە لوغم ڕێژ کرابوون)، هەڵداو بەدەستی منداڵانەوە تەقینەوەو دوو مناڵ شەهید بوون[٣٥].

لەو هەنگاوانەی کە ڕژێمی عێراق گرنگی پێداون بۆ زیاتر جێبەجێ کردنی سیاسەتی جینۆساید، ساڵی ١٩٨٤-١٩٨٥، (٧٧٦) حەوت سەد و حەفتاو شەش قوتابخانەی داخست، بەگوێرەی فەرمانێکی نهێنی کە لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی دهۆکەوە دەرچووە، بەژمارەی (٥٧٥ لە ١٩٨٥/١٠/٢)دا پشت بەنامەی نهێنی و تایبەتی لیژنەی تەنسیقی ئەمنی - لجنة التنسيق الامنية - دهۆک دەبەستێ بەژمارەی (٢٣٦) لە ١٩٨٥/٩/٢٢دا دەرچووە جەخت لەسەر داخستنی (٢٠٨) قوتابخانە دەکات. لە هەولێریش،

بەڕێوەبەری گشتی پەروەردە فەرمانێکی دەرکردووە کە (٢٠٠) دوو سەد قوتابخانە لە دێهاتەکانی پارێزگای هەولێر دابخرێت، ئەویش بەگوێرەی نووسراوی ژمارەی (٢٢٧٩) لە ١٩٨٥/٩/١ دا. لە پارێزگای سلێمانی و کەرکووکیش هەر لەو ماوەیەدا (٣٤٠) سێ سەد و چل قوتابخانە بە فەرمانی دەزگای ڕژێم داخران. هەروەها دەیان قوتابخانەی تر لەناوچەکانی سەر بەموسڵ و دەیان قوتابخانەی سەر بە ئاکرێ و شێخان داخران. دەزگاکانی ڕژێم، مامۆستاو کارمەندانی ئەو قوتابخانە داخراوانەیان بانگ کردووە، کە لە ماوەی ئەو ساڵەی خوێندندا نابێ بچنەوە سەر کار هەروەها ئاگاداری قوتابخانەکانی پارێزگاکانیشیان کردووە کە قوتابیانی ئەو قوتابخانە داخراوانە وەرنەگرن[٣٦].

ڕێکخـــــراوی Amnesty International لە لەندەن، لە ١٩٨٩/٣/١٤ دا ڕایگەیاند کە لە شاری سلێمانی لەماوەی نێوان ئەیلول و تشرینی یەکەمی ١٩٨٥دا، ڕژێمی عێراق (٣٠٠) سێ سەد منداڵی کوردی ئیعدام کردووە کە تەمەنیان لە ١٧ تا ٢٢ ساڵانە، لەهەمان ڕاگەیاندندا باس لە کوشتنی (٥٠٠٠) پێنج هەزاریش کراوە، کە بەچەکی کیمیاوی لە هەڵەبجە بەرکەوتوون[٣٧].

پەرلەمـــانی ئەوروپا لە بڕیاری ڕۆژی ١٩٨٧/٤/٩دا، نارەزایی خـــۆی دەربارەی گرتن و ئازاردان و کوشتنی (٣٠٠) سێ سەد منداڵ و لاوی شاری سلێمانی دەردەبڕێ. لەهەمان بڕیاردا پەرلەمانی ئەوروپا عێراق وا ئاگادار دەکاتەوە کە بەردەوامبوونی ئەو جۆرە کارانە دەگاتە ئەنجامی خراپ لە پەیوەندی نێوان عێراق و وڵاتانی ئەوروپادا[٣٨]. لە سەردەمی بەعسییە فاشییەکاندا، تا کۆتایی ١٩٨٦ زیاتر لە (١٨٩٥) هەزار و هەشت سەد و نەوەت و پێنج گوند و شار بەر ڕاگواستن کەوتوون، کە ژمارەی خێزانە ڕاگوێزراوەکانی (١٤٧٦) هەزار و چوار سەد و حەفتاو شەش گوندیان دەگاتە (٨٤,٨٧٧) هەشتاو چوار هەزار و هەشت سەد و حەفتا و حەوت خێزان[٣٩].

لە سیاسەتی ڕژێمی عێراقدا، لەگەڵ وێرانکردن و ڕاگواستن_دا، بەعەرەب کـردن-تعریب- بەرنامەیەکی تایبەتە بۆ شێواندنی سیمای نەتەوەیی

کوردستان. هەر بۆ نموونە لە شاری کەرکوک، سەرباری ڕووخاندنی هەزاران ماڵی کورد و دەربەدەرکردنی خەڵکەکەی، بەپشتێنەیەکی (٢٠,٠٠٠) بیست هەزار لە دواکەوتووترین ماڵە عەرەب، بە ڕەبایەو ئۆردوگای سەربازی ئابڵۆقە دراوە. ئەگەر تێکڕای سەرژمێری هەر ماڵێک بە ٤-٥ کەس دابنێین، ئەوا سەرژمێری ئەو عەرەبە نیشتەجێ کراوانە دەگاتە ٨٠-١٠٠ هەزار کەس، زۆربەیان ئەفسەر و پۆلیس و ئەمن و ئیستیخبارات و مخابەرات و کەسانی حیزبی و کەسانی سەر بەسیاسەتی ڕژێمن کە بەشێوەیەکی شۆڤێنییانە پەروەردە کراون تا کورد و تورکمان بەدوژمنی خۆیان بزانن، بۆیە وەزعێکی نائاسایی لە کەرکووک دروست کراوە بۆ تەعریب کردنی تەواوی شارەکەو دەوروبەرەکەی[٤٠]. سیاسەتی وێرانکردن و ڕاگواستنیش بووە هۆی ئەوەی تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٦ زیاتر لە (٤٢,٤٨٨ کم٢) واتە ٤٩,٤١٪ ی خاکی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عێراق تەعریب بکرێ، کە زۆربەی لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمی بەعسدا ئەنجام دراوە[٤١]. یاساناسی کورد د. نوری تاڵەبانی ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بەعەرەبکردن لە سەردەمی بەعسییەکاندا چەند پەرەی سەندووە، بەگوێرەی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ زۆربەی دانیشتوانی کەرکووک کوردن، لەبەرئەوەی ئەو شارە بەکانگای نەوت دەوڵەمەندە، ڕژێمی عێراق، کەوتە تەعریبکردنی، تەنانەت بۆ ئەوەی مێژووی شارەکە بشێوێنێ ئەرشیف و بەڵگەنامەکانی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ی فەوتاندووە[٤٢].

تاوانی جینۆساید لە ساڵانی ١٩٨٧ و ١٩٨٨دا گەیشتە چڵەپۆپە، ئەوەبوو بەشێوەیەکی فراوان چەکی کیمیاوی بەکارهات و هەزاران کەس بوونە قوربانی و زۆربەی ناوچەکانی کوردستان ژیانیان تێدا نەما، ڕۆژی ١٩٨٧/٦/٢٨ ڕژێمی عێراق بەبۆمبای ژەهراوی بۆردومانی شاری سەردەشتی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئێرانی کرد و (١٣٢) سەد و سی و دوو کەس کوژران و (٥٠٠٠) پێنج هەزار کەسیش بریندار بوون[٤٣]. بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی، پێچەوانەی پرۆتۆکۆڵی جنێف (١٩٢٥) دەربارەی قەدەغەکردنی بەکارهێنانی گازی ژەهراوی و خنکێنەر. ڕاگەیاندنی

بەڕێوەبەری گشتی پەروەردە فەرمانێکی دەرکردووە کە (٢٠٠) دوو سەد قوتابخانە لە دێهاتەکانی پارێزگای هەولێر دابخرێت، ئەویش بەگوێرەی نووسراوی ژمارەی (٢٢٧٩) لە ١٩٨٥/٩/١ دا. لە پارێزگای سلێمانی و کەرکووکیش هەر لەو ماوەیەدا (٢٤٠) سێ سەد و چل قوتابخانە بە فەرمانی دەزگای ڕژێم داخران. هەروەها دەیان قوتابخانەی تر لەناوچەکانی سەر بەموسڵ و دەیان قوتابخانەی سەر بە ئاکرێ و شێخان داخران. دەزگاکانی ڕژێم، مامۆستاو کارمەندانی ئەو قوتابخانە داخراوانەیان بانگ کردووە، کە لە ماوەی ئەو ساڵەی خوێندندا نابێ بچنەوە سەر کار هەروەها ئاگاداری قوتابخانەکانی پارێزگاکانیشیان کردووە کە قوتابیانی ئەو قوتابخانە داخراوانە وەرنەگرن[٣٦].

ڕێکخـــــراوی Amnesty International لە لەندەن، لە ١٩٨٩/٣/١٤ دا ڕایگەیاند کە لە شاری سلێمانی لەماوەی نێوان ئەیلول و تشرینی یەکەمی ١٩٨٥دا، ڕژێمی عێراق (٣٠٠) سێ سەد منداڵی کوردی ئیعدام کردووە کە تەمەنیان لە ١٧ تا ٢٢ ساڵانە، لەهەمان ڕاگەیاندندا باس لە کوشتنی (٥٠٠٠) پێنج هەزاریش کراوە، کە بەچەکی کیمیاوی لە هەڵەبجە بەرکەوتوون[٣٧].

پەرلەمـــانی ئەوروپا لە بڕیاری ڕۆژی ١٩٨٧/٤/٩دا، نارەزایی خـــۆی دەربارەی گرتن و ئازاردان و کوشتنی (٣٠٠) سێ سەد منداڵ و لاوی شاری سلێمانی دەردەبڕێ. لەهەمان بڕیاردا پەرلەمانی ئەوروپا عێراق وا ئاگادار دەکاتەوە کە بەردەوامبوونی ئەو جۆرە کارانە دەکاتە ئەنجامی خراپ لە پەیوەندی نێوان عێراق و وڵاتانی ئەوروپادا[٣٨]. لە سەردەمی بەعسییە فاشییەکاندا، تا کۆتایی ١٩٨٦ زیاتر لە (١٨٩٥) هەزار و هەشت سەد و نەوەت و پێنج گوند و شار بەر ڕاگواستن کەوتوون، کە ژمارەی خێزانە ڕاگوێزراوەکانی (١٤٧٦) هەزار و چوار سەد و حەفتاو شەش گوندیان دەکاتە (٨٤,٨٧٧) هەشتاو چوار هەزار و هەشت سەد و حەفتا و حەوت خێزان[٣٩].

لە سیاسەتی ڕژێمی عێراقدا، لەگەڵ وێرانکردن و ڕاگواستن‌دا، بەعەرەب کردن-تعریب- بەرنامەیەکی تایبەتە بۆ شێواندنی سیمای نەتەوەیی

کوردستان. هەر بۆ نموونە لە شاری کەرکوک، سەرباری ڕووخاندنی هەزاران ماڵی کورد و دەربەدەرکردنی خەڵکەکەی، بەپشتێنەیەکی (٢٠,٠٠٠) بیست هەزار لە دواکەوتووترین ماڵە عەرەب، بە ڕەبایەو ئۆردوگای سەربازی ئابلۆقە دراوە. ئەگەر تێکڕای سەرژمێری هەر ماڵێک بە ٤-٥ کەس دابنێین، ئەوا سەرژمێری ئەو عەرەبە نیشتەجێ کراوانە دەگاتە ٨٠-١٠٠ هەزار کەس، زۆربەیان ئەفسەر و پۆلیس و ئەمن و ئیستیخبارات و مخابەرات و کەسانی حیزبی و کەسانی سەر بەسیاسەتی ڕژێمن کە بەشێوەیەکی شۆڤێنییانە پەروەردە کراون تا کورد و تورکمان بەدوژمنی خۆیان بزانن، بۆیە وەزعێکی نائاسایی لە کەرکووک دروست کراوە بۆ تەعریب کردنی تەواوی شارەکەو دەوروبەرەکەی[٤٠]. سیاسەتی وێرانکردن و ڕاگواستنیش بووە هۆی ئەوەی تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٦ زیاتر لە (٤٢,٤٨٨ کم٢) واتە ٤٩,٤١٪ ی خاکی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عێراق تەعریب بکرێ، کە زۆربەی لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمی بەعسدا ئەنجام دراوە[٤١]. یاساناسی کورد د. نوری تاڵەبانی ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بەعەرەبکردن لە سەردەمی بەعسییەکاندا چەند پەرەی سەندووە، بەگوێرەی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ زۆربەی دانیشتوانی کەرکووک کوردن، لەبەرئەوەی ئەو شارە بەکانگای نەوت دەوڵەمەندە، ڕژێمی عێراق، کەوتە تەعریبکردنی، تەنانەت بۆ ئەوەی مێژووی شارەکە بشێوێنێ ئەرشیف و بەڵگەنامەکانی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ی فەوتاندووە[٤٢].

تاوانی جینۆساید لە ساڵانی ١٩٨٧ و ١٩٨٨دا گەیشتە چڵەپۆپە، ئەوەبوو بەشێوەیەکی فراوان چەکی کیمیاوی بەکارهات و هەزاران کەس بوونە قوربانی و زۆربەی ناوچەکانی کوردستان ژیانیان تێدا نەما، ڕۆژی ١٩٨٧/٦/٢٨ ڕژێمی عێراق بەبۆمبای ژەهراوی بۆردومانی شاری سەردەشتی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئێرانی کرد و (١٣٢) سەد و سی و دوو کەس کوژران و (٥٠٠٠) پێنج هەزار کەسیش بریندار بوون[٤٣]. بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی، پێچەوانەی پرۆتۆکۆڵی جنێف (١٩٢٥) دەربارەی قەدەغەکردنی بەکارهێنانی گازی ژەهراوی و خنکێنەر. ڕاگەیاندنی

ڕەسمی سەرۆکی عێراق صدام حسین کە دەڵێ: (عێراق چەکی کیمیاوی کاریگەری هەیە، ئەوەندەی مەگەر هەر تەنیا ئەمریکاو یەکێتی سۆڤێت هەیان بێ)[٤٤]. نیشانەی خۆپیشاندانی عێراقە کە بەپێچەوانەی بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتانەوە پشتی بەوە قایمە دەتوانێ چەکی کیمیاوی بەکار بهێنێت.

ڕژێمی عێراق نەک هەر چەکی کیمیاوی، بەڵکو چەکی بایۆلۆژیشی ئامادە کردبوو بۆ شەڕی کوردستان. نووسراوێکی ڕەسمی و تەواو نهێنی و تایبەت لە (مقر آمرية قاطع اربيل - الحركات)ـەوە بە ژمارە ج ١/٢٧٧ لە ١٩٨٦/٨/٣ بۆ هێزەکانی سەر بەکەرتی هەولێر، بەگوێرەی چەند نووسراوێکی نهێنی تر کە یەکێکیان نووسراوی تەواو نهێنی و تایبەتی وەزارەتی بەرگرییە بەژمارەی ١٠١٣٥ لە ١٩٨٦/٥/٢٥ کە داوای ئاماری نیوساڵانەی-جرد نصف سنوي- هەموو ئەو چەکانەیە (کیمیاوی و بایۆلۆژی)و ئامادە کردنی ئەو ئامارە پێش ڕۆژی ١٩٨٦/٨/٦[٤٥].

بڵاوکردنەوەی (دانانی) چەکی کیمیاوی و بایۆلۆژی لە سەربازگەکانی کوردستاندا نیشانەی خۆ ئامادەکردنە بۆ بەکارهێنانی، ئەمەش پێشنیازی ڕژێم ڕوون دەکاتەوە لە تاوانەکانیدا دەرهەق بەگەلی کورد. ئەوەبوو بەشێوەیەکی بەرباد لە کوردستاندا چەکی کیمیاوی بەکار هات، بەتایبەتی تاوانی شەهید کردنی شاری هەڵەبجە لەدونیادا دەنگی دایەوە.

هەڵەبجە شارێکی مێژووییە و جێگایەکی دیاری هەیە لەژیانی کەلتووری و سیاسی و ئابووری کوردستاندا، نزیکەی (٧٠,٠٠٠) حەفتا هەزار کەس دانیشتووی ئەم شارە بوون، ١٦و ١٩٨٨/٣/١٧ ڕژێمی عێراق تاوانێکی زۆر دڕندانەی لەدژی هەڵەبجەو ناوچەکانی دەوروبەری کرد. فڕۆکەکانی ڕژێم بەچەکی کیمیاوی کەوتنە ژەهرباران کردن، زۆربەی سەرچاوەکان لەو بارەیەوە ژمارەی شەهیدانی هەڵەبجە بە(٥٠٠٠) پێنج هەزار دەستنیشان دەکەن و ژمارەی بریندار و بەرکەوتووش بە (١٠,٠٠٠) دە هەزار. خەڵکێکی زۆر لەدوای ئەوەی بەرەو شارەکانی تر ڕایان کرد، ڕژێم بەشێکی زۆری گرتن. پاشماوەی دانیشتوانی هەڵەبجەو ناوچەکانی دەوروبەری بەبێ ماڵ و حاڵیان

ئاوارەی ئێران و ئەو ناوچە سنوورییانەی بوون. دەزگاکانی ڕاگەیاندنی وڵاتانی دونیا ڕاپۆرت و وێنەو فلیمی ڕووداوەکانی هەڵەبجەیان زۆر بڵاوکردەوە. نوێنەری سکرتێری گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ ئێران و عێراق دیدەنی نەخۆشخانەکانی ئێران و عێراقی کردووەو ئەو ڕاستییەی تۆمار کردووە کە چەکی کیمیاوی لەدژی خەڵکی کوردستان بەکارهاتووە[٤٦]. ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین ناوی ٢١٩٨ دوو هەزار و سەد و نەوەد و هەشت شەهیدی هەڵەبجە ساڵی ١٩٨٩ بڵاوکراوەتەوە[٤٧].

سەفیری ئوستراليا لە UN نامەیەکی بەکۆنفرانسی چەک داماڵین لە ١٩٨٨دا، داوە، نامەکەش ١٩٨٨/٩/٩ لەلایەن وەزیری دەرەوەی ئوسترالیاوە بۆ ئەو کۆنفرانسە نێردراوە. لەو نامەیەدا نارەزایی دەربارەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لەدژی کورد دەربڕراوە[٤٨].

لیژنەیەکی تایبەت و شارەزا، کە پێکهاتبوو لە کۆمەڵێ دکتۆر بە سەرپەرشتی بەڕێوەبەری کۆلێژی تەکسیکۆلۆژی-ژەهرناسی-Toxicologic- لە زانکۆی (-Gent بەلجیکا)، پرۆفیسۆر A. Hryndrickx، سەردانی کوردستانی کردوەو گەلێ نموونەی لە شاری هەڵەبجەو ناوچەکانی دەوروبەریان گەیاندووەتە زانکۆی خێنت و لێکۆڵینەوەی زانستییان لەسەر کردووە، لیژنەکە لە ١٠-١٩٨٨/٤/١٤ دیدەنی عێراق و ئێرانی کردووە، ڕاپۆرتی لیژنەکە: Report No. 88/ku 2/PJ 881 دەڵێ: هەڵەبجە، مەرگ باڵی بەسەردا کێشاوەو ناوچەیەکی بێ مرۆڤ و بێ ئاژەڵ، باڵندەی بۆگەنبووی تێدا بڵاوبووەتەوە.

ئەندامانی لێژنەکە کەلاکی ئاژەڵ و تەرمی مردوو، نموونەی چاڵی بۆمبا و، پارچەی بۆمبا و جل و بەرگ و بەردی ناوچەکەیان بردووەو لە زانکۆی خێنت تاقیکردنەوەی زانستییان لەسەر کردووە. لیژنەکە ڕایگەیاندووە بەلای کەمەوە سێ جۆر گازی ژەهراوی کاریگەر بەکارهاتووە. لیژنەکە هەموو ئەو نموونانەی لەژێر تاقیکردنەوەی زانستیدا یەکالا کردووەتەوەو مەترسی ئەو گازانەی باس کردووە[٤٩].

ئەنجــومــەنی ئابووری و کــۆمــەڵایەتی UN لیــژنەی مــافی مــرۆڤ، لە ١٩٨٨/٩/١٦، لە ڕاپۆرتێکدا لەسـەر کێشەی مـافی مرۆڤ لە ئێران و عێراق دەدوێ، بەتایبـەتیش پێشـێل کردنێکی ترسناکی مـافی کورد/خـاڵی ٢٨/ لەو ڕاپۆرتەدا، لیژنەی مـافی مـرۆڤ بەتایبـەتی ئەوەی دیاری کردووە کە لە عێراق پێشـێلکردنی مـافی کورد بەرنامـە ڕێژکـراوە: کوشـتنی هەمـە جۆر، گـرتن، ڕاگـواسـتن، دوورخـسـتنەوەو بەکۆمـەڵ لە سـێدارەدان. هـەمـان ڕاپۆرت ئەوە دیاری دەکــات کــە لە ئازاری ١٩٨٨دا زیاتر لە (٤٠٠) چوار ســەد کــەس لە ناوچەکـانی قـەرەداغ لە سلێـمـانی بەرچەکی کـیـمـیـاوی کەوتوون. هەروەها ڕاپۆرتەکە باسی کیمیا بارانـەکەی شێخ وەسـان لە دۆڵی بالیسـان/هەولێر/ دەکات لە ١٩٨٧دا و دەڵێ کە (٣٦٠) سێ سەد و شەست کەس شـەهید بوونە، ئەوەش ڕوون کراوەتەوە کە سـاڵی ١٩٨٥ لە سلێمانی (٣٠٠) سێ سـەد کەس زیاتر کوژراون و گەلێکیش گیراون و بێ سەر و شوێن کراون.

خـاڵی ٣٠ ڕاپۆرتەکە باس لە وێرانکردنی گوندی چیمـەن-نزیک کەرکووک- دەکات لە ١٩٨٦/١١دا، کە (١٥٠) سەد و پەنجا کـەس بەمناڵ و ئافرەتیشەوە کوژراون. خاڵی ٣٣ دەڵێ کە لیژنەی مـافی مرۆڤ ئاگاداری ئەوەیە لە باکووری عێراق حکوومـەتی عێراق بەردەوامـە لە سـەرکوتکردنی بزووتنەوەی ڕزگاری کورد. لیژنەکە ناوی (٤٦) چل و شەش کوردی لەلایە کە حکوومەت گرتوونی کـە هەشـتـیـان منـاڵن، ئەوە لە سـەرجـەمی (١٥٠) سـەد و پەنجـا کـەس کە گیراون(٥٠).

لە ئازاری ١٩٨٨ـەوە، ڕژێمی عــێــراق لە ســـەرانســـەری ناوچەکــانی کوردستاندا زنجیرە هێرشی زەمینی و ئاسمانی بەناوی -الانفال- دەست پێ کـرد. بە قـسـەی وەزیری بەرگـری عـێـراق، هێـرشـەکـانی-الانفـال- تا ١٩٨٨/٩/٥ی خـایاند. لەو هێـرشـانەدا سـوپای عـێـراق دەسـەڵاتێکی بێ سنووری وێرانـکردن و سـووتانـدن و گـرتن و کـوشـتن و تاڵانکردنی هـەبوو. بەتایبەتیش لەو هێرشانەدا خـەڵکی بێ چەکی دێهاتەکان مەبەست بوون، بەبێ جـیـاوازی لەنێـوان چەکـدار و بێ چەک و پیـر و ئافـرەت و منداڵدا. وەزیری

بەرگری عێراق-عدنان خیرالله-کوشتنی خەڵکی مەدەنی بەوە پاساو دەدات کە مەدەنی و چەکدار هەر بەرگی کوردییان لەبەردایە، بۆیە دەڵێ: (لایمکننا تمییز المتمرد منهم عن غیره لانهم یلبسون الزي الکردي جمیعا الا اذا کان هناك من یحمل بیده سلاحا)[٥١]. واتە: ناتوانین جیاوازی بکەین لەنێوان یاخی و کەسانی تردا چونکە هەموویان بەرگی کوردییان لەبەردایە، تەنیا مەگەر کەسانێک کە چەکیان بەدەستەوە بێ.

بەگوێرەی بەندی چوارەمی پەیماننامەی جنێف/١٩٢٥/ هەموو وڵاتانی بەشداری پەیماننامەکە لێپرسینەوەی نێونەتەوەییان لە ئەستۆدایەو دەبێ کەسانی ڕەسمی و ناڕەسمی چاودێری حوکمی ئەو پەیماننامەیە بکەن چ لە سنووری ئەو دەوڵەتەدا بێ یا لە دەرەوەی سنووری وڵاتەکە)[٥٢].

بەگوێرەی دەستووری دادگای نۆرنبێرگ و تۆکیۆ، تاوانبارانی جەنگ سزادران. لەبەرئەوەی هەموو تاونباران بەر سزا نەکەوتن و نەدرانە دادگای نێونەتەوەیی، بۆیە بەگوێرەی ئەم بەڵگەنامانە دەبێ تاوانبارانی تاوانی نێونەتەوەیی بدرێنە دادگای نێونەتەوەیی:

١- بەیاننامەی سزادانی تاوانکارانی تاوانی جەنگ لە ١٢/١/١٩٤٢دا[٥٣].

٢- بەیاننامەی بەرپرسیارکردنی هیتلەرییەکان بەهۆی تاوانەکانیانەوە لە ٣٠/١٠/١٩٤٣دا[٥٤].

٣- دەستووری دادگای جەنگ (نێونەتەوەیی) لە ٨/٨/١٩٤٥دا[٥٥].

٤- بڕیاری کۆمەڵەی گشتی UN لە ١٢/١/١٩٤٦ و لە ٣١/١٠/١٩٤٧دا، دەربارەی تەسلیم کردنەوە و سزادانی تاوانبارانی جەنگ[٥٦].

٥- پەیماننامەی جنێف دەربارەی داکۆکیکردن لە قوربانیانی جەنگ لە ١٢/٨/١٩٤٩[٥٧].

٦- پەیماننامەی ١٩٤٨ دەربارەی قەدەغەکردنی جینۆساید و سزا خستنە سەر تاوانکارانی[٥٨].

ئەنجومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی-لیژنەی مافی مرۆڤ لە UN لەراپۆرتی

١٩٩٢/٢/١٨دا کە (٩٦) لاپەڕەی قەبارە گەورەیە لەلایەن نوێنەری تایبەت، ڤان دێر ستویل-ەوە ئامادەکراوە، بەدوور و درێژی باسی تاوانەکانی ڕژێمی کردووە لە عێراقدا، بەتایبەتیش جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە تاوانی جینۆساید دەرهەق بەکورد پراکتیک دەکرێ. لەو ڕاپۆرتەدا جگە لەبیروڕای لێکۆڵینەوەی نوێنەری تایبەتی UN دەربارەی تاوانی جینۆساید لەدژی گەلی کورد، نووسەری ڕاپۆرتەکە ئەوەی بۆ ڕوون بووەتەوە کە ڕژێمی عێراق بە کۆمەڵ خەڵکی کوشتووە، بەکۆمەڵ خەڵکی ڕاگواستووە، بەکۆمەڵ خەڵکی گرتووە، ژیان و پێشکەوتنی ناوچە کوردییەکانی شێواندووەو سنووردار کردووەو چەکی مۆدێرن، بەتایبەتیش کیمیاوی بە کارهاتووە، ژیانێکی سەخت بۆ خەڵکەکە دروست کراوە، ئەو کارانەش بەشێوەی سیستێماتیک ئەنجام دراون، بۆیە بەگوێرەی بیروڕای ڤان دێر ستویل-ئەو کارانە دەچنە چوارچێوەی ئەو کردارانەی کە لەبەندی دووەمی پەیماننامەی ١٩٤٨دا دەربارەی قەدەغەکردنی تاوانی جینۆساید و سزاخستنە سەر تاوانکارانی، دیاری کراوە[٥٩]. ڕاپۆرتەکەی لیژنەی مافی مرۆڤ گەلێ زانیاری گرنگی تێدایە، جگە لەوەی کۆمەڵێ لەو بەڵگەنامە و نووسراو و بڕیارە نهێنییانەی ڕژێمی عێراقی تێدایە کە لە دژی گەلی کوردن، لەو بەڵگەنامانەدا ئەو سیاسەتە دیاری کراوە کە بریتییە لە چۆڵکردنی کوردستان لە خەڵک، وێرانکردنی ناوچەکان، بە کۆمەڵ ئیعدامکردنی خەڵکی کوردستان بەئافرەت و مناڵ و پیریشەوە، قەدەغەکردنی بوونی مرۆڤ و تەنانەت ئاژەڵیش لەو ناوچانەدا. ڕاپۆرتەکە ڕوونی دەکاتەوە کە بە ئەنقەست و بە مەبەست ڕژێمی عێراق نزیکەی (٤٠٠٠) چوار هەزار گوندی وێران کردووە کە ئەمەش ئەنجامەکەی بووەتە سەرگەردان کردنی زیاتر لە (١,٠٠٠,٠٠٠) یەک ملیۆن مرۆڤی کورد.

ئەوەی کە بێ ڕاڕایی لەو دۆکومێنتانەدا ڕوون دەبێتەوە، بەکۆمەڵ گوللەباران کردنی پیاو و ئافرەت و منالی کوردە لەکاتی هێرشەکانی-ئەنفال دا/خالی ٩٨/[٦٠].

له یەکێ لەو بەڵگەنامانەی کە وێرانکردنی کوردستانیان تێدا ڕوون کراوەتەوە پلان و نەخشەی وێرانکردنەکە بەم جۆرە دیاری کراوە:

١- وێرانکردنی ٣٨٣٩ گوند و شار

٢- وێرانکردنی ١٧٥٧ قوتابخانە

٣- وێرانکردنی ٢٤٥٧ مزگەوت و جێگەی ئاینی

٤- وێرانکردنی ٢٧١ نەخۆشخانەو تیمارگە

٥- ڕاگواستنی ٢١٩,٨٢٨ خێزان .../ خالی ١٠٠ بەڵگەنامەی UN/ ڕاپۆرتەکەی لیژنەی مافی مرۆڤ لە خالی (١٠٣)دا دەڵێ:

(ترسناکترین بەدرەفتاریی لە دژی خەڵکی کورد ئەوەبوو کە بەجۆرێکی ڕێکوپێک و بە بەرنامە -سیستیماتیک- خێزانە کوردەکان"بەناوی ئاژاوەچیانەوە" ئیعدام دەکران. ئەو بەڵگەنامانەی کە لە دایەرەکانی ئەمن و ئیستخبارات و دەزگاکانی ناوچە کوردییەکاندا گیران، شایەتی ئەوە دەدەن کە بیرۆی کاروباری باکوور - مکتب شؤون الشمال-لەماوەی نێوان پایزی ١٩٨٧ تا زستانی ١٩٨٩ و لەهێرشی ئەنفالدا سەرپەرشتی کارەکانی کردووە. زۆربەی ناوەڕۆکی ئەو بەڵگەنامانە بریتین لەتالانکردن، کۆنترۆڵ کردن و دەست بەسەراگرتنی مەڕو ماڵات، داخستنی فابریکەی مریشک و ڕاگواستنی خەڵک بۆ ئۆردوگای زۆرەملێ. ئەگەر سەرجەم ئەو بەڵگەنامانە بەیەکەوە سەیر بکرێن، لەگەڵ ئەو سەرچاوانەی کە لە بەکۆمەڵ ئیعدامکردنی"ئاژاوەچییەکان" لەگەڵ خێزانەکاندا، دەدوێن، ئەوا کارەکە زەقتر ڕوون دەبێتەوە، بەتایبەتیش لە هەندێ بەڵگەنامەدا باسی بەکۆمەڵ ئیعدامکردن دەکرێ). پاشتر ڕاپۆرتەکە لە هەمان خالی (١٠٣)دا دەڵێ، کە نوێنەری UN لیستەی (١٥,٠٠٠) پانزە هەزار خێزانی وەرگرتووە کە سەرەونگوون کراون کە نزیکەی (١٨٢,٠٠٠) سەد و هەشتاو دوو هەزار کەس دەبن بێ سەر و شوێن. هیچ گومانی تێدا نییە ئەم سیاسەتە بەتایبەتی هێرشەکانی ئەنفال سیاسەتی جینۆسایدە. ڕاپۆرتی UN لە ل ٧٧-٩٦ ناوی (٢٣٩) دوو سەد و سی و نۆ کەسی تۆمار

کردووه، لەوانەی کە سەرنگوون کراون[٦١].

پێویستە ئەوەش بڵێین، لەو ڕاپۆرتەی UN دا، جگە لەوەی بەتایبەت و بەفراوانی بە بەڵگەنامەوە، باس لە جینۆسایدی کورد کراوە، باس لە کوشتن و چەوساندنەوەی عەرەب و تورکمان و ئاسورییەکانیش کراوە، کە لەئەنجامی سیاسەتی ڕژێمی عێراقدا تووشی بوونە.

کۆمەڵەی هاوکاری کردنی گەلانی چەوساوە لە ئەڵمانیا لە بەڵگەنامەی ژمارە (٤) شوباتی ١٩٩١، بەتێروتەسەلی لەگەڵ لایەنی چەوساندنەوەو قڕکردنی گەلی کورد دواوەو بە شایەت و بەڵگەشەوە لە جینۆساید دەدوێ. لەو ڕاپۆرتەدا باس لە ڕاگواستنی (٧٠,٠٠٠) حەفتا هەزار کەس دەکات ساڵی ١٩٨٨ لە ناوچەکانی کەرکووک و سلێمانی و هەولێر. بەگوێرەی هەمان ڕاپۆرت ڕۆژهەڵاتناسی بەریتانی (ئێدوارد مۆرتیمیر) لە ژمارەی ڕۆژی ١٩٨٩/٦/٣، لە ڕۆژنامەی (فاینانشل تایمس)دا باسی لە ڕاگواستنی (٣٠٠,٠٠٠) سێ سەد هەزار کەس دەکات. ڕاپۆرتەکە دەڵێ: لە ناوەڕاستی مانگی ئەیلولی ١٩٨٨دا صدام حسین ڕێگەی دا (٢٠٠) ڕۆژنامەنووسی جیهانی سەر لە ناوچە کوردییەکانی عێراق بدەن، لەدوای ئەوەی کە داگیرکرابوون، هەمان کات نزیکەی (١٥٠,٠٠٠ - ٢٠٠,٠٠٠) سەد و پەنجا هەزار تا دوو سەد هەزار کورد بەرەو تورکیا و ئێران لە ترسی هێرش و چەکی کیمیاوی هەڵاتبوون.

پەیامنێری ڕۆژنامەی بەرلینی (تاگیس تسیتۆنگ)، (یوگین گانشیلیخ) لە ١٩٨٨/٩/٢١ دا دەنووسێ: کاتێ لەناو کۆپتەرێکی سوپای عێراقدا بەسەر ناوچە کوردییەکانەوە بووین، گوندی دێرینی کوردەکانمان دەبینی وەکو پارچە خاکێکی ڕەش داگەڕاو دیاربوون، بەدرێژایی سنووری ئێران و تورکیا لە ناوچە کوردییەکاندا، هەرێمێکی ڕەش لە خوارەوە دیار بوو، گوندی وێرانکراو، ماڵی بەسەریەکدا ڕووخاو، پارچە بۆمباو خاکی سووتاوی نێوان چیای ڕووتاوە، تاکە مرۆڤێک نەدەبینرا حکوومەتی عێراق لە هەوڵی سی ساڵەیدا توانی زاڵ بێت بەسەر کوردەکاندا، زیاتر لە چوار هەزار گوند وێران

کراون و خەڵکەکەی ئاوارە بوونە[٦٢].

هەمان ڕاپۆرت دەڵێ: بەگوێرەی ڕاپۆرتی فیدراسیۆنی جیهانی مافی مرۆڤ لە پاریس لە ١٢ /١٩٩٠/-١/١٩٩١ دا ڕایگەیاندووە کەڕاگواستنی چوار شاری کوردستانی عێراق دەستی پێ کردووە. بەگوێرەی هەمان ڕاگەیاندن خەڵکێکی زۆر بێ کار ماونەتەوە. ژمارەی ڕاگوێزراوانیش خۆی لە دوو ملیۆن کەس دەدات[٦٣]. ڕۆژنامەنووس هیلگا گراهام لە نۆیزێرڤەری بەریتانی لە ١٩٨٩/٧/٢ دا دەنووسێ: (قەلادزێی سەد هەزار کەسی وێران کرا، زۆر دڕندانە داری بەرداری دارستانەکانیش هەڵکێشران)[٦٤].

سیاسەتی ڕژێمی عێراق بۆ جێبەجێ کردنی زنجیرە هێرشی ئەنفال پێشتر نەخشەی بۆ کێشرابوو، پلانی ڕێکوپێکی بۆ دانرابوو. ئەم خۆ ئامادەکردنە پێشەکییەش لە تاوانی جینۆسایددا، وەکو هەر تاوانێکی تر بە (پێشنیاز) پێناسە دەکرێ و ئەو خۆ ئامادەکردنەش، ئەگەرچی درێژە پێدانی سیاسەتێکی کۆنەو پاشتر قۆناغ بە قۆناغ جێبەجێ دەکرا، لەگەڵ بەڵگەنامەی نهێنی ڕژێمی عێراقدا جێگیر بووە. هەروەکو (ڤان دیرستویل) نوێنەری تایبەتیUN لە ڕاپۆرتەکانیدا جەختی لەسەر دەکات و دەڵێ کە هێرشەکانی ئەنفال باش نەخشەیان بۆ کێشرابوو، بەبەرنامەوە کە پێشتر وەکو لە(٣٣) سی و سێ برووسکەی ڕژێمدا دەردەکەوێ کە لەیەک ناوچەدا لە نیسانی ١٩٨٨دا جێبەجێ کراون[٦٥].

ڕووداوەکانی ئەنفال، ئەوەندە سەخت و دڕندانە بوون، ئاسەواری بەژیانی گەلی کوردەوە، بۆ ماوەیەکی زۆر دەمێنێ. بەشێکی زۆری خەڵکی گەرمیان-یان بە (٢٥٠) زیلی عەسکەری بردووە بۆ زیندانەکانی نوگرە سەلمان. یەکێک لەو زیندانییانە دەگێڕێتەوەو دەڵێ:

(لەچوار زیندانی نوگرە سەلمان (٥,٠٠٠) پێنج هەزار گیراوی خەڵکی گەرمیان بووین، لە ماوەی شەش مانگ و دە ڕۆژدا (١,٧٨٥) هەزار و حەوت سەد و هەشتا و پێنج ژن و پیاو و منداڵ مردن. لەکاتی مردنی هەر زیندانییەکدا، چوار پیاویان بانگ دەکرد بۆ چاڵ هەڵکەندن و ناشتنی بێ

شـۆردن و بێ کـفن کـردن. لەدوای چەند ڕۆژ سـەگ لاشـەی مـردووەکـانی دەخوارد)[٦٦].

بەڵگەنامـەی نهـێنی بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی سلێـمـانی ژ. ٢٥١٦٣ لە ١٩٨٨/١٠/٢٩ دا بۆ بەڕێوەبەری ئەمنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی، ڕوونی دەکاتەوە بە گوێرەی قسەکردنێکی تەلەفۆنی، ئەم کارانە ئەنجام دراون:

١- ٩ تاوانبار، بەگوێرەی بڕیاری (مکتب تنظیم الشمال) ئیعدام کراون.

٢- ١٩ گوناهبار، لەبەر ئەوەی لە دێهاتە قەدەغەکراوەکاندا بوون، بەگوێرەی برووسکەی (أمن تنظیم الشـمـال) ژمـارە (٤٠٠٨) لە ١٩٨٧/٦/٢٠دا /خاڵی ٥/ ئیعدام کراون.

٣- ٦ خێزان کە ژمارەیان ١٨ کەس بوو لە کەسوکاری تاوانباران، بەگوێرەی فەرمانی(مکتب تنظیم الشمال) ئیعدام کراون.

٤- فەرمـانی ئیعدامکردنی (٤٧) چل و حەوت گوناهبار لە (رئاسة محكمة الثورة) دەرچووە.

٥- (٢,٥٣٢) دوو هەزار و پێنج سـەد و سی و دوو کـەس و (١٨٦٩) هەزار و هەشت سـەد و شـەست و نۆ خـێزان کـە ژمـارەیان (٩,٠٣٠) نۆ هەزار و سی کەس بوو لەکاتی ئەنفالەکاندا دەسگیر کراون و ڕەوانەی ئۆردوگای سەربازی کراون لە پارێزگای تەئمیم[٦٧].

لە ٢٥-١٩٨٨/٨/٢٩ فڕۆکەکانی ڕژێمی عێراق کەوتنە کیمیابارانکردنی ناوچەی دهۆک. لە کاتی هێرشەکانی ڕژێمدا لە ناوچەی بادینان، (٤٣٠) چوار سـەد و سی خـێزان پەنـایان بردبووە بەر ئەشکەوتەکـان و لە (گـەلی بازێ)دا خۆیان حەشاردابوو (٢٤٧٠) دوو هەزار و چوار سەد و حەفتا کەسیان مناڵ و ئافرەت بوون. لە بەرەبەیانی ١٩٨٨/٨/٢٩ دا شـەش فڕۆکەی ڕژێمی عێراق کـەوتنە بۆمـبـارانکردنی گـەلی بازێ بەچەکی کـیـمـیـاوی، پاش چەند دەقیقـەیەکی تر شـەش فڕۆکەی دیکە دووبارە هێرشـیـان کردەوە سـەر گـەلی بازێ، ئەنجـامـیش (٢٩٨٠) دوو هەزار و نۆ سـەد و هەشـتـا کـەس شـەهید

بوون[٦٨].

هێرشەکانی ڕژێمی عێراق، هەر تەنیا مەبەستی سەرکوتکردنی بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوایەتی گەلی کورد نەبوو، بەڵکو مەبەست وێرانکردنی کوردستان و چۆڵکردنی لە گەلی کوردیش بوو. بۆ جێبەجێ کردنی ئەم سیاسەتەش دەبوایە زۆر دڕندانە کاری بۆ بکرایە، هەر وەکو تاوانەکانی ڕژێم دەریان خست. ئالێرەوە مەبەستی جینۆساید وەکو تاوانێکی سەربەخۆ دەردەکەوێ، کە ئەم قۆناغە جێبەجێ کردنی سیاسەتێکی پلان و نەخشە بۆکێشراوە، هەر وەکو لە گەلێ بڕیار و بەڵگەنامەی نهێنی ڕژێمدا دەردەکەوێ:

١- بڕیاری نهێنی و تایبەتی حیزبی بەعس - لقی زاخۆ - ژمارە س/ش/٦٦٤ لە ١٩٨٧/٦/١٤دا بۆ هەموو ڕێکخراوە حیزبییەکان، کە پشت بە نووسراوی(مکتب تنظیم الشمال ٢٦٥٠/٢٨ لە ١٩٨٧/٦/٢) دەبەستێ[٦٩].

٢- نامەی فەیلەقی یەک/س ف/ ١٧٢٥ لە ١٩٨٧/٦/٢١دا کە پشت بەنامەی (قیادة مكتب تنظيم الشمال س ف/٤٠٠٨ لە ١٩٨٧/٦/٢٠) دەبەستێ[٧٠].

٣- نامەی (قيادة مكتب تنظيم الشمال ٤٠٠٨/٢٨ لە ١٩٨٧/٦/٢٠) بۆ سەرکردایەتی فەیلەقی یەک و دوو پێنج[٧١]. : بەئیمزای (علی حسن مجید)ـەوە لێپرسراوی سەرکردایەتی ڕێکخستنی باکوور و بە مۆری - مجلس قيادة الثورة- ـەوە کۆمیتەی کاروباری باکوور، وێنەی بۆ هەموو پارێزگاکانی کوردستان نێردراوە. لەو بەڵگەنامانەدا بڕیار دراوە دەبێ گوندەکانی کوردستان کە ژیانیان تێدا قەدەغە کراوە، تا ١٩٨٧/٦/٢١ دانیشتوانی کۆبکرێتەوە و لە ٦/٢٢ یشەوە:

١- هەموو گوندەکان ناوچەی قەدەغەکراون.

٢- بوونی مرۆڤ و ئاژەڵیش قەدەغەیە لەو ناوچانە.

٣- تەقەو دەسرێژ ئازادە، سوپا بۆی هەیە هەموو جۆرە چەکێک بەکاربهێنێ.

٤- هەموو جۆرە هاتوچۆیەک لەو ناوچانەدا قەدەغەیە.

٥- هیچ جۆرە کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەک لەو ناوچانەدا ناکرێ.

٦- سوپا شەو و ڕۆژ ئازادە لە گرتن و کوشتنی هەر زیندەوەرێک (مرۆڤ و ئاژەڵ) لەو ناوچانەدا.

٧- هەر کەسێک لەو ناوچانەدا بێت دەسگیر دەکرێ، ئەوەی تەمەنی لە ١٥ ساڵ بەرەو سەرەوە بێ تا ٧٠ ساڵ ئیعدام دەکرێ.

٨- جاشەکان هەر تالانییەک دەکەن بۆ خۆیان دەبێ جگە لە چەکی قورس.

ئاشکرایە کە هەموو بڕیارێکی ڕژێم لە عێراقدا، حوکمی یاسای هەیەو دەبێ جێبەجێ بکرێ. ئەم بڕیاردانەش پێش زنجیرە هێرشی ئەنفال، ڕژێم خۆی بۆ ئامادە کردبوو، ئەوەتا دەبینین لە ١٩٨٧/٦/٣٠ ـەوە(ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق) بەسەرکردایەتی صدام حسین بەبڕیاری ژمارە(٤٥٧) هەموو بەڕێوەبەرایەتییەکی کشتوکاڵی لە پارێزگاکانی کوردستاندا هەڵوەشاندەوەو هەموو بڕیار و بەڵگەنامەیەکی کشتوکاڵیش هەڵوەشێندرانەوە[٧٢]. لە بڕیاری ژمارە/١١٨٢ لە ١٩٨٨/٨/٢٨ یشدا وەزیری بەرگری بڕیاری وێرانکردنی دێهاتەکانی کوردستانی جێگیر کردووە[٧٣].

ئیتر وێرانکردنی کوردستان دێهات و ناحیەو قەزاکانیشی گرتەوە، لە سەرجەمی ناوچەکانی سەر بەهەولێر و کەرکوک و سلێمانی، لەو هێرش و وێرانکردنەشدا هیچ شتێک نەپارێزراوە، دێهات و ناحیەو قەزاکان بە قوتابخانەو نەخۆشخانەو تیمارگەو مزگەوت و کلێساو مەرقەد و جێگای مێژوویی، تەنانەت لە هەندێ ناوچە گۆڕستانەکانیشی گرتووەتەوە.

یەکێک لەو دەزگا نێودەوڵەتییە دیارانەی هێرشەکانی عێراقیان مەحکوم کرد، پەرلەمانی ئەوروپا بوو، ڕۆژی ١٩٨٨/٩/٤ لەدژی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی و وێرانکردنی هەزاران گوندی کوردستانی عێراق، هاتە دەنگ و لەبڕیاری نارەزایی و مەحکومکردنی ئەو تاوانانەدا، ئەندامانی پەرلەمان داوایان لە وڵاتەکانی خۆیان کرد کە پشتگیری لە گەلی کورد بکەن[٧٤].

لەو ماوەیەی سەردەمی وێرانکردن و کیمیاباران کردنی کوردستان، لەسەر

داوای سەرۆکی لیژنەی پەیوەندی دەرەوە لە کۆنگرێسی ئەمریکی، لیژنەیەکی تایبەت کە پێکهاتبوو لە شارەزایانی چەکی کیمیاوی سەردانی ناوچەکانی کوردستانیان کردبوو لە سنووری تورکیاوە، پیتر و. کالبرایت و کریستۆفر ڤان هولین لە١٢/٩/١٩٨٨ لە ڕاپۆرتی خۆیاندا دەڵێن:

بەرکەوتووانی چەکی کیمیاوی سەدان هەزار دەبن. حکوومەتی عێراق بە سیاسەتێکی سەربازییەوە ئاڵاوە بەمەبەستی چۆڵکردنی کوردستانی عێراق لە دانیشتوانی، ئەو سیاسەتەش بریتییە لە:

١- وێرانکردنی گوند و شارەکانی کوردستان.

٢- ڕاگواستنی هاووڵاتییە کوردەکان و کۆکردنەوەیان لە ئۆردوگاکاندا، تاکو کۆنترۆڵی سەربازی بکرێن.

٣- دوورخستنەوەی کورد بۆ دەرەوەی کوردستان.

٤- بەکارهێنانی تاکتیکی تۆقاندن، بەتایبەتیش بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بۆ وەدەرنانی خەڵکی و چۆڵکردنی ناوچەکانیان، ئەنجامی ئەم سیاسەتەش گۆڕینی تایبەتمەندی نەتەوەیی و کەلتووری کوردی و نەهێشتنی جۆری ئاسایی ئەو ژیانەیە کە چەندین سەدەیە لەسەری ڕاهاتوون[٧٥].

لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا بڕیاری ژمارە (٢٧٦٣-٥)، دەربارەی قەدەغەکردنی جینۆساید لە ١٩٨٨ دەرچوو، ئەو بڕیارە ڕەفتاری عێراق لە کوردستان بەجینۆساید پێناسە دەکات[٧٦].

کوردستانی بەعێراقەوە لکێندراو پانتایی (٨٦,٠٠٠ کم٢) هەشتاو شەش هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەیە، ڕژێمی عێراق تا کۆتایی ١٩٨٨ ئەو خەڵکەی کە لەکوردستان مابوونەوە لە پانتایی(٧,٧٢٩ کم٢) گەمارۆی دابوون واتە (٧٨,٢٧١ کم٢) لە کوردستان دابڕیبوو[٧٧].

بۆنموونە، ئەگەر ئامارێکی ئەو وێرانکارییانەی پارێزگای کەرکووک بکەین، دەبینین وێرانکارییەکە ئەوەندە بەرفراوانە بەجارێک سیمای ناوچەکان

دەگۆڕێ و لە ناوچەی ئاوەدان و بەرھەمدارەوە دەبێتە، یەک پارچە وێرانەو بێ ژیان کە لە ئەنجامی ئەو تاوانکارییانەدا تابلۆیەکی ترسناک بەم جۆرە دێتە بەرچاو:

١- (٧٨١) حەوت سەد و هەشتاو یەک گوند سووتێنران و وێران کران.

٢- (٦) شەش ناحیە وێران کراون: قادر کەرەم، نەوجول، سەنگاو، ڕێدار، تیلەکۆ، ئاغجەلەر.

٣- (٣٩,١٧٨) سی و نۆ هەزار و سەد و حەفتاو هەشت خانووبەرە ڕووخێنراون.

٤- (٤٥,٧٧٧) چل و پێنج هەزار و حەوت سەد و حەفتاو حەوت خێزان ئاوارەو بەند و بێ سەروشوێن و هەڵاتوون.

٥- (٢٢٨,٨٨٥) دوو سەد و بیست و هەشت هەزار و هەشت سەد و هەشتاو پێنج کەس ئاوارەو بەند و بێ سەروشوێن و هەڵاتوون.

٦- (٣٨١) سێ سەد و هەشتاو یەک قوتابخانە، (٦٥٧) شەش سەد و پەنجاو حەوت مزگەوت و(٦٩) شەست و نۆ نەخۆشخانە وێران کراون.

٧- (٥٢) پەنجاو دوو عەماراو و مەکینەی ئاو هەڵگوێز، (٤٢) چل و دوو فابریکەی مریشک، (٧٥) حەفتاو پێنج مەکینەی ئاش و (١٣٥) سەد و سی و پێنج کارێزو ئەستێڵ، تەقێنراونەتەوە.

٨- (١٥٧) سەد و پەنجاو حەوت تەکییە و خانەقاو شوێنەواری ئاینی وێران کراون.

٩- (١,٤٣٥) هەزار و چوار سەد و سی و پێنج ڕەز و باخات سووتێنراون و وێران کراون.

١٠- (١٧,٢٠٠) حەڤدە هەزار و دووسەد دەزگای تراکتۆر و ماشێنی هەمەجۆر سووتێنراون و تاڵان کراون.

١١- (٤٧٢,٧٧٠) چوارسەد و حەفتاو دوو هەزار و حەوت سەد و حەفتا سەر مەڕو بزن تاڵان کراون و فەوتێنراون.

١٢- (١٥,٠٠٠) پانزه هەزار سەر ڕەشه وڵاخ تاڵان کراون و فەوتێنراون.

١٣- (٥٧٠,٠٠٠) پێنج سەد و حەفتا هەزار تەن گەنم و جۆ و دانەوێڵە سووتێنراون و فەوتێنراون[٧٨].

لە پارێزگای دهۆکیش لە ساڵی ١٩٨٥ـەوە تا ١٩٨٧، (١٥٠) سەد و پەنجا گوند وێران کراون. لە کاتی ئەنفالەکانیشدا لە ٢٥/٨-١٥/٩/١٩٨٨ وێرانکردنەکە بەم جۆرە بوو:

١- (٢٣٣) دووسەد و سی و سێ گوند لە ئامێدی.

٢- (٣٥) سی و پێنج گوند لە ئاکرێ.

٣- (١٩) نۆزده گوند لە شێخان.

٤- (١٠٠) سەد گوند لە زاخۆ.

٥- (٦٣) شەست و سێ گوند لە دهۆک[٧٩].

سیاسەتی جینۆساید لەدژی گەلی کورد، ئەوەنەبێ هەر لە سنووری عێراقدا جێبەجێ بکرێ، بەهەموو لایەکدا پەلی هاویشتووە، ئەو خەڵکەی لەبەر هێرشی کیمیاوی و وێرانکردنی ناوچەکانیان پەنایان بردبووە بەر تورکیا و لەوێ ببوونە پەناهەندە، لەوێش لە ئۆردوگای پەناهەندەییدا، ڕژێمی عێراق هەوڵی بە کۆمەڵ کوشتنی داون، ڕۆژی ٨/٦/١٩٨٩ لە ئۆردوگای ماردین، بەهۆی بەکرێگیراوانی عێراقەوە، نانی ژەهراوی دابەش کرا بەسەر پەنابەرەکاندا، بۆ ئێوارەی ڕۆژی دوایی کاریگەریتی نانە ژەهراوییەکە ئاشکرابوو. بەکۆمەڵ منداڵ و ژن و پیاو نەخۆش کەوتن، تا ١١/٦/١٩٨٩ ژمارەی نەخۆشەکان گەیشتە ٣,٠٠٠ سێ هەزار کەس، نەخۆشییەکان بریتی بوون لە هەناسەسواری، لەش خوران، چاوئاوسان، سەرگێژبوون، لەرز لێهاتن و ئیفلیج بوون[٨٠]. ڕێکخراوی Helsinki watch لە مانگی ٦/١٩٩٠ لە ڕاپۆرتێکدا دەربارەی تورکیا باسی مەینەتی و ناخۆشی ژیانی کورد دەکات. هەر لەوێشدا وتراوە کە لە ئۆردوگای قزڵ تەپە و ماردین (٢,٠٠٠) دوو هەزار کەس بەهۆی نانی ژەهراوییەوە دەرمان خوارد کراون، ژەهرەکەش کاری لە

دەمار و لەشی نەخۆشەکان کردووە. بەگوێرەی هەمان ڕاپۆرت لە ئۆردوگای دیاربەکریش، ١/١/١٩٩٠، (١,٧٠٠) هەزار و حەوت سەد کەس دەرمان خوارد کراون[٨١]. ڕێکخراوی Amnesty Internationa لە لەندەن، لە ١٢/١/١٩٨٨ لە ڕاپۆرتی خۆیدا، ڕژێمی عێراقی بە بەکارهێنانی ژەهری سالیوم لەدژی هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆن تاوانبار کردووە[٨٢]. دیارە بەکارهێنانی ژەهر، ئەگەر بۆ کەسانی دیاریکراویش بێت، لەناو خواردندا، لەگەڵ ئەوەی کە خۆی کارێکی تاوان و قەدەغەیە، وەک تریش خەڵکێکی زۆر دەگرێتەوە، چونکە هەر مەبەست لە بەکارهێنانەکە تاوانێکی نائاسایی و کۆمەڵ کوژە.

وەکو لە بەشی یەکەمی ئەم باسەدا ڕوونمان کردەوە، لە بەندی دووەمی پەیماننامەی ١٩٤٨ دەربارەی قەدەغەکردنی جینۆساید، وەکو لە خاڵی دووەمیدا دیاری کراوە، مەرج نییە تاوانی جینۆساید، هەر ڕاستەوخۆ کوشتنی بەدەنی -فیزیکی-بێ، بەڵکو (زیان گەیاندن بە لەش و شێواندنی بیری ئەندامانی ئەو کۆمەڵە) هەر لە چوارچێوەی تاوانی جینۆسایددایە. سەرباری ئەوەش، ژەهر دەبێتە هۆی پەککەستن یا ئیفلیج بوونی ئەندامانی لەش، دیارە چ بۆ پیاو یا ئافرەت ڕەنگە کار لە ئەندامانی زاووزێ بکات، چ بەپەک خستنیان یا شێواندنی ئەندامانی لەش و بیر و دەماری منداڵەکانیان، کە ئەمە دەچێتە خانەی جینۆسایدی بایۆلۆژییەوە.

ئەنجومەنی ئاسایشی UN، ٩/٥/١٩٨٨ بڕیاری ژمارە (٦١٢)ی بە مەحکوم کردنی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دەرکرد. ئەگەرچی ڕاستەوخۆ ناوی عێراق نەهاتووە، بەڵام کاتی ئەو بڕیارە پەیوەندی بە عێراقیشەوە هەیە کە ئەو سەردەمە بەفراوانی گازی کیمیاوی لە کوردستان و لە شەڕی عێراق-ئێرانیشدا بەکار دەهێنا[٨٣].

٢٨ ئەندامی کۆنگرێسی ئەمریکا لە کۆتایی ١٩٨٨دا نامەیەکی نارەزاییان دەربارەی شاڵاوی ڕاگواستن لە کوردستان بەهۆی سەفارەتی عێراق لە واشنتۆن ناڕاستەی صدام حسین کردووە. لەو نامەیەدا دەڵێن: (بەسەدان

هەزار کورد لە باکووری ولاتەکەتان لە ماڵ و گوندی خۆیان ڕاگوێزراون، بەپێی ڕاپۆرتی سەرچاوە ئاگادارەکان ئەم هەڵوێستە لەپاش ئەوە ئەنجام دەدرێ کە هەمان ناوچە ساڵی پار وەبەر هێرشی چەکی کیمیاوی کەوتبوو. ئەم ڕاگواستنە پێشێل کردنێکی ڕاشکاوی مافەکانی مرۆڤن). هەروەها ئەندامانی پەرلەمانی ئەمریکی لە نامەکەیاندا داوا دەکەن: (دەستبەجێ ئەم سیاسەتە ڕاگرن و ڕژێمی عێراق بەڵێنێکی هەمیشەیی بدات کە ڕێز لە مافەکانی گەلی کورد دەگرێ و دەپارێزێ)[٨٤]. هەر لەدوای بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لە هەڵەبجە، ئەندامانی پەرلەمانی بەریتانی نامەیەکیان نارد بۆ خاڤییر پێرێس دیکویلار-ی سکرتێری UN، داوایان لە UN کردبوو کە بەر لەو جۆرە کارانە بگیرێ[٨٥].

بەرەی کوردستانی عێراق ١٩٨٩/٢/٢٤ یاداشتنامەیەکی ئاڕاستەی لیژنەی مافی مرۆڤ UN کردووە، گەلێ فاکتی تاوانی جینۆساید لەوێدا ڕوون کراوەتەوە. لیستی ئیعدام کراوانی ساڵی ١٩٨٨، (١٤٦) سەد و چل و شەش قوربانی چەکی کیمیاوی، لیستی قوربانییانی ئەنفال و کیمیاوی لە ١٩٨٨/٨/٢٥ـەوە، ناوی (٧٢٤) حەوت سەد و بیست و چوار گوند و شارۆچکەی وێرانکراوی ناوچەکانی سلێمانی و کەرکووک لە مانگی ئازار و نیسانی ١٩٨٨دا، ناوی (٤٤٨) چوارسەد و چل و هەشت گوندی وێرانکراوی ناوچەی دهۆک و موسڵ لە کۆتایی مانگی ئاب و سەرەتای مانگی ئەیلولی ١٩٨٨دا، ڕوونکردنەوەی وەزعی ئاوارە بووان، وێنەی دێهاتە وێرانکراوەکان و کاسێتی ڤیدیۆ دەربارەی کارەساتی هەڵەبجە لە ئازاری ١٩٨٨دا[٨٦].

لەو یاداشتنامەیەدا هەندێ لە تاوانەکانی ڕژێمی عێراق لە ساڵی ١٩٨٨دا بەم جۆرە دیاری کراوە:

١- گرتنی (٧,٤٠٧) حەوت هەزار و چوار سەد و حەوت ئافرەتی ناوچەی زەنگەنە و جەباری و سەنگاو و بەندکردنیان لە قەزای دوبز-سەر بە کەرکووک.

٢- گرتنی (٥,٦٠٠) پێنج هەزار و شەش سەد ئافرەتی تر و بەندکردنیان لە

ناوچەی یایچی-کەرکووک.

٣- گرتنی (٤,٥٦٠) چوار هەزار و پێنج سەد و شەست مناڵ لەگەڵ ئافرەتاندا.

٤- گرتنی(٧,٦٤٠) حەوت هەزار و شەش سەد و چل کەس و سەرنگوون کردنیان.

٥- سووکایەتی کردن بە ڕەوشت و کەرامەت و ئازاردانی ئافرەتان.

بەگوێرەی یاداشتنامەکەی بەرەی کوردستانی، وا زانراوە، ئەو منداڵانەی تەمەنیان لە شەش مانگ تا ساڵێکە، ڕژێم بەخەڵکی دەیانفرۆشێتەوە، هەر منداڵی بە(٥٠) دینار. هەروەها یاداشتنامەکە دەڵێ، کە لە ناوچەکانی کەرکووک و سلێمانی لە ئازار و نیسانی ١٩٨٨دا، (٤٠,٠٠٠) چل هەزار خێزان گیراون، (١٦,٠٠٠) شانزە هەزاریان لە زیندانەکانی ڕژێمدان[٨٧]. یەکێک لەو بەڵگەنامانەی کە ڕاست و ڕەوان سیاسەتی ڕژێم ڕوون دەکاتەوە لە دژی گەلی کورد، جیاوازی نەکردنە لە نێوان خەڵکی مەدەنی و خەڵکی چەکداری بزووتنەوەی کورددا. بەگوێرەی ناوەڕۆکی ئەو بەڵگەنامەیە، خەڵکی مەدەنیش دەبێ ئیعدام بکرێن، سەیر لەوەدایە خەڵکی برینداری مەدەنیش بەتایبەت دیاری کراوە کە دەبێ ئیعدام بکرێن. هیچ یاسایەک نە زەمینی نە ئاسمانی، ئەم سیاسەتەی بۆ قووت ناچێ!

نووسراوی بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی هەڵەبجە ژمارە/٣٣٢٤ لە١٤/٥/١٩٨٧دا بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی سلێمانی دەڵێ:

" أعلمتنا معاونية أمن حلبجة ببرقيتها: ٢٨٥٨ في ١٤/٥/١٩٨٧ بأنه اعلمتهم أمرية الجحفل الوطني الخامس ببرقيتها ٦٤٥ في ١٣/٥/١٩٨٧ مايلي: بأنه امر السيد قائد الفيلق الاول بايعاز من الرفيق علي حسن المجيد اعدام الجرحى المدنيين بعد التاكد من المنظمة الحزبية ودائرة الامن والشرطة ومركز الاستخبارات مناوئتهم للسلطة..."[٨٨].

بەگـوێرەی ئەو نووسـراوە، بە فـەرمـانـی علی حـسن المجـیـد، بریندارە مەدەنییەکان لەدوای ئەوەی لە ڕێکخراوی حیزبی و دایەرەی ئەمن و پۆلیس و ئیستیخباراتەوە دیاری بکرێ لە دژی ڕژێمن، ئەوا دەبێ ئیعدام بکرێن. لەلایەکی ترەوە نەک هەر کەسانی مەدەنی ئەگەر خۆشیان بەڕژێمدا نەیەت ئیعدام دەکرێن، بەڵکو جیاوازیش نییە لەلای ڕژێم لەنێوان کەسێک کە خۆی کارێکی کردبێ و کەسێکی تری خزمی یا نزیکی ئەو کەسە، ئەگەر ئاگاداریش نەبێ، تەنانەت ئافرەت و منداڵیش لەو سیاسەتە دەرناهاوێژرێن و بەردەکەون.

لە نووسراوی نهێنی و تایبەتی بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی حوکمی زاتییەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی هەولێـر ژمـارە /٥٥٨٥ لە ١٦/٤/١٩٨٨دا دیار و ئاشکرا، علی حسن المجید دەڵێ: (ئەگەر خێزانەکەی خۆی تەسلیم کردووە یا گەڕایەوە مانگانە وەربگرێ، پێویستە دوای بکەون بۆ نەهێشتنی ڕەچەڵەکی ئەو پیسە)[٨٩]. دواکەوتنیش بۆ نەهێشتنی ڕەچەڵەک فەوتاندنی یەکجارەکییە، با ئەوەش بڵێین. لە دەقە عەرەبییەکەدا تەنیا مەبەست لە ژنی کابرا نییە بەڵکو سەرجەمی ئەندامانی خێزانەکەیە، چونکی بە"کۆ" دەنووسێ، وەکو دەقی نووسراوەکە دەڵێ: (... من الضروري متابعتهم لقطع نسل هذا القذر).

دیسـانەوە نووسـراوی نهـێنی بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی سلێمـانی ژمـارە /١٧٩٨٠ لە ٢٥/٥/١٩٨٧ دا بۆ ئـەمـنـی نـاوچـەی ئـۆتـۆنـۆمـی، بـەنـاو ئـەوە دیارکراوە، نەک هەر ئەوانەی لە چالاکییەکی دژی ڕژێمدا بەشـدار بوونە، بەڵکو دایک و باوکیش لەگەڵ خۆیاندا ئیعدام کراون[٩٠].

نـامـەیەکی تری نهـێنی (مکتب تنظيم الشـمـال) ژمـارە/ ٤٣٥٠ لە ٧/٩/١٩٨٧دا، ئەوە ڕوون دەکاتەوە لە کۆبوونەوەی ٦/٩دا بە سەرپەرشتی علی حسن المجید جەخت لەسەر بەدەرنانی خێزان و کەس و کاری "ئاژاوەچییەکان!" دەکات، تەنیا ئەو پیاوانەی کە تەمەنیان لە ١٢–٥٠ ساڵە دەگیرێن. لەهەمان نامەدا ئەوە ڕوون کراوەتەوە کە هەر خێزانێک ئەگەر کەسێکیان لە شەڕدا لێ کوژراوە (مەبەست لە شەڕی عێراق – ئێرانە)، یا دیل بووە، یا فـەوتاوە، ئەوا ئەو خـێـزانە تەنیـا دایک و کـوڕەکـانی

بەدەردەنرێن[٩١]. ئەمە گوایە ڕەحم بەو خێزانانە کراوە کە کەسێکیان لە پێناو بەعسدا فەوتاوە، دایک و کوڕەکانی ئاوارە دەکرێن و کوڕەکانی ناگیرێن! علی حسن المجید، حاکمی دەسەڵاتداری بەسەر خەڵکی کوردستاندا سەپێنراو قسەو ڕەفتاری یاسایەک بوون کەس نەیدەتوانی جێبەجێیان نەکات. لە کۆبوونەوەی ١٥/٤/١٩٨٩دا دەڵێ: (نحن احرار في ان نحرم المواطنين من دخول مكان (س) ونعلنه مكانا محظورا او لانحرم المدن)[٩٢]. واتە: (ئێمە ئازادین لەوەی کە هاووڵاتیان قەدەغە بکەین نەچنە جێگای (س) و ڕای بگەیێنین کە شوێنێکی قەدەغەکراوە یان ئازادین لەوەی ناو شارەکان قەدەغە نەکەین).

جینۆساید، کارێکی وای کردووە بەهەزاران کەس ئاوارەبن، ژمارەی ئاوارەکانی کوردستانی بەعێراقەوە لکێنراو کە لەئۆردوگای ئێراندا پەنابەرن تا ساڵی ١٩٨٩ خۆی لە (٣٨٢,٣٩٨) سێ سەد و هەشتاو دوو هەزار و سێ سەد و نەوەت و هەشت کەس دەدات[٩٣].

ئەمە جگەلەوەی بەهەزاران کەس لە تورکیا و ئێران و پاکستان و وڵاتە ئەوروپییەکان و ئەمریکا و کەنەدا بوونەتە پەناهەندە و بڵاوبوونەتەوە. بەگوێرەی زانیاری سەرچاوەکانی ئەوروپا لە ساڵی ١٩٨٨، لەکوردستانی بەعێراقەوە لکێندراو، ژمارەی قوربانییان بەلای کەمەوە (١٠٠,٠٠٠) سەد هەزار دەبێ[٩٤].

لیژنەی داکۆکیکردن لە کەمە نەتەوەییەکان لە UN لە کۆنگرەی مانگی ٨ و ١٩٨٨/٩دا جنێف لە وەزعی مافی مرۆڤی کۆلیەوە لە وڵاتانی دونیادا، نوێنەری هۆڵەندا تیۆدۆر بۆڤن- Thodor Boven لەباسی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ بەتایبەتیش بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لەدژی کورد لە عێراق، داوای لە کۆمەڵگەی جیهانی کرد لەرێگای UNـەوە کە بەر بەعێراق بگرن لەو ڕەفتارە نامرۆڤانەیدا. نوێنەری چەند وڵاتێکی تریش باسی وێرانکردنی کوردستانـو بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی و بەکۆمەڵ ئیعدامکردنی خەڵکی کوردستانیان کرد. ئەنجام ناوی عێراق خرایە لیستی ئەو وڵاتانەوە کە مافی

مـرۆڤ پێشـێل دەكـەن. دەبوایە ١٩٨٨/٩/١ بەیاننـامـەیـەك دەرچووایە لەدژی عـێـراق بەڵام نوێنەری مـەغـریب بەبیـانووی ئەوەی ئەو بەیانە دەبێـتـە هۆی تێكچـوونی گـفـتـوگـۆی نێـوان عـێـراق و ئێـران لە جنێف لەدژی ئەو بڕیارە وەسـتـایەوە. یانزە وڵاتی تریش پشـتـگـیـری نوێنـەری مـەغـریـبـیـان كـرد و داكـۆكـیـیـان لە عـێـراق كـرد، بەبێ گـوێدانە قـڕكـردنی كـورد و وێرانكردنی وڵاتەكەی، لەو وڵاتانەش كە پشـتگیری مەغریبیان كرد (ئۆردن، جەزائیر، چین، یەكێتی سۆڤێت، سۆماڵ، یۆگسلافیا، ڕۆمانیا، كوبا، ژاپۆن... هتد)[٩٥].

مـەسـەلەی پشـتـگیـری كردنی مـافی مـرۆڤ، پەیوەندی بەسـیاسـەتی وڵاتانەوە هەیە، خـۆ هەر ئەمریكا لەبەرئەوەی پەیوەندی لـەگەڵ عێراقدا باش بوو، سـاڵی ١٩٨٢ ناوی عێراقی لەلیستی ئەو وڵاتانە دەرهاوێشت كە مافی مـرۆڤ پێشێل دەكەن[٩٦].

كەواتە لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەوەی لە سـتانداردی جیهانیدا هـەیە لە پاراستنی مافی مرۆڤ لە جێبەجێ كردندا بەرژەوەندی وڵاتانی جیـهان دەور دەبینێت لە مـیكانیـزمی جـێـبـەجـێ كـردنی پرنسـیپ و بنەمـاكـانی یاسـای نێودەوڵەتاندا.

لە٣٠/١-١٩٨٩/٣/١٠ لە ڕێكخـراوی مـافی مـرۆڤ لە UN لەدەورەی ٤٥ هەمیندا، چەند ڕێكخـراوێكی جیـهانی داوای داكۆكی كردنیان لە گەلی كورد كرد كە سیاسـەتی جینۆسـایدی لەدژ ڕەفتـار دەكرێت لەعێراق بەتایبـەتیش باسـی گـرتن و ئازاردان و ئیـعـدامكردنی منـاڵان جـەخـتی لەسـەر كـرا. ڕێكخـراوی Amnesty International داوای لە ڕێكخراوی مـافی مرۆڤ كرد كە هەموو هەوڵێك بدات بۆ پاراستنی منـاڵان و داكۆكیكردن لە مافی مرۆڤ لە عێراقدا[٩٧].

١٩٩٠/٥/١٤ دەزگـاكـانی ڕژێم لە سلێـمـانی وەفـاتنامـەی ١٥٠ كـەسی ئیـعـدامكراویان دایەوە خـاوەنـەكـانیـان و داوایان لێ كـردن كـە نابێ تەعزێ دابنێن و لە هۆی مردن و جێگەی ناشتنی كوڕەكانیان بپرسن[٩٨].

ڕێکخراوی مافی مرۆڤ لە کوردستان لە تەلگرامێکدا بۆ ئەنجومەنی ئاسایشی UN لە نیویۆرک لە ١٩٩١/١٢/٧دا دەربارەی نارەزایی خەڵکی کە مانیان گرتووە لە نان خواردن لە سلێمانی لەدژی سیاسەتی ڕژێمی عێراق و گەمارۆی ئابووری کوردستان دەدوێ. تەلگرامەکە داوای ئازادی تەواو بۆ کوردستان دەکات، کە چیتر دەسەڵاتی ڕژێمی عێراقی بەسەرەوە نەمێنێت[٩٩].

ڕاپۆرتێکی کۆمەڵەی گشتی UN لە ١٩٩٠/٥/٤ لەسەر عێراق باس لە تاوانەکانی ڕژێمی عێراق دەکات بەتایبەتیش ڕاگواستنی (٥٠٠.٠٠٠) پێنج سەد هەزار کەسی دێهاتەکانی کوردستان لە ساڵی ١٩٨٧ـەوە دیاری دەکا و دەڵێ:

(حکومەتی عێراق لە حوزەیرانی ١٩٨٩دا ڕایگەیاندووە کە ناوچەیەکی بەتاڵ و بێ مرۆڤ پێک دێنێ)، هەروەها ڕاپۆرتەکە جۆری سیاسەت و تاوانەکانی ڕژێمی عێراق ڕوون دەکاتەوە[١٠٠].

لەکاتی ڕاپەڕینەکانی جەماوەری کوردستان، لە ساڵی ١٩٩١دا، ڕژێمی فاشی عێراق، کۆنترۆڵی لەدەست دا و جەماوەر دەستی بەسەر دام و دەزگاکانی ڕژێمدا گرت، بەتایبەتی دایەرەو زیندانە سامناکەکانی ئەمن و موخابەرات و ئیستیخبارات. دەرگای زیندانەکانیان شکاند و خەڵکی کۆت و پێوەند کراو ئازاد کران، بەڵگەنامە و دۆکومێنتە نهێنییەکانی ڕژێم کەوتنە دەست گەل و بەڵگەی تاوانی جینۆساید کە پێشتر لە ژیانی ڕۆژانەدا دەبینرا، ئیتر بە نووسراو و بەکاسێت دەردەکەوتن، لەوانە (٣٠) سی تەن بەڵگەنامە، کاسێتی ڤیدیۆ و وێنە، لەلایەن بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوایەتی کوردەوە، ڕەوانەی ئەمریکا کران[١٠١].

بەگوێرەی ڕاپۆرتی لیژنەی مافی مرۆڤ لە E/CN.4/ 1993/ 31, UN خاڵی ٩٧/ -١٠٣/ جینۆساید لەدژی گەلی کورد پراکتیکە کراوە، هەروەها ڕاپۆرتێکی تری لیژنەی مافی مرۆڤ E/CN. 4/ 1993/ 45 جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە (١٤) چواردە تەن لەو بەڵگەنامانەی لە دەزگاکانی ڕژێمدا گیراون،

بەڵگەی تەواوی تاوانی جینۆسایدن لە کوردستان لە ساڵانی ١٩٨٧-١٩٨٨[١٠٢]. دوای هەرەسهێنانی ڕژێم، لەدوای ڕاپەڕینەکەی ساڵی ١٩٩١، ئەو جێگایانەی کە لە خەڵکی قەدەغە کرابوون و لەژێر کۆنترۆڵی ڕژێمدا بوون، جەماوەری کوردستان توانییان بچنە سەر ئەو شوێنانە و گەلێ نهێنی ئاشکرا بکەن. لەگەلێ ناوچەی کوردستاندا گۆڕستانی بەکۆمەڵ و چاڵە مەیت دۆزرانەوە، کە ڕژێمی فاشی عێراق بەکۆمەڵ خەڵکی کوشتووەو چاڵی بۆ هەڵکەندوون و بەکۆمەڵ شاردوونییەوە. لە ئەیلولی ١٩٩١دا لەنزیک ڕێگای هەولێر-مەخموور جەماوەری هەولێر گۆڕستانێکیان دۆزییەوە کە چواردەوری تەلبەند کرابوو، (١,٥٠٠) هەزار و پێنج سەد لاشەی تێدا بوو، لە پیاو و ئافرەت و منداڵ، چەندین خێزانی تێدا بوو کە هەر هەموویان لەوێدا نێژرابوون[١٠٣].

ڕۆژی ١٩٩١/١٠/٢٧ گۆڕێکی بە کۆمەڵ مرۆڤ تێدا نێژراو، لەسەر ڕێگای موسڵ - دهۆک دۆزرایەوە کە تەرمی(٧٠) حەفتا کەسی تێدا بوو، هەندێکیان ژن و منداڵ بوون. چاڵێکی ٣ مەتری بە بەرزایی ٦ مەتر گڵی بەسەردا کرابوو، بەگوتەی ئەو ئامێرە پزیشکییانەی لەناو گۆڕەکەدا دۆزرانەوە، دیارە کاربەدەستانی ڕژێمی عێراق خوێنیان دەرهێناون پاشان هەموویان بەکۆمەڵ کوشتوون[١٠٤].

لە تشرینی یەکەمی ١٩٩١دا لە شوێنی سەربازگەی سارداو، لەنزیک سلێمانی، گۆڕێکی بەکۆمەڵ دۆزرایەوە. ئەوانە لە ١٩٨٥/١٠/١٧ گیرابوون و ڕۆژی دوایی واتە ١٩٨٥/١٠/١٨ لە گۆڕەپانی نالی لەناو شاری سلێمانیدا ئیعدام کرابوون[١٠٥]. هەر لە نزیک سلێمانی لە کۆتایی هاوینی ١٩٩٤دا، گۆڕستانێکی شەهیدانی ڕاپەڕینەکەی ١٩٩١ دۆزرایەوە کە تەرمی(٤٤) چل و چوار ژن و پیاو و منداڵی تێدا بوو[١٠٦].

کارێکی تری سیاسەتی جینۆساید لەدژی گەلی کورد، مین چاندنە لە سەرجەم ناوچەکانی کوردستاندا، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بەبێ جیاوازی مرۆڤ و ئاژەڵیش بەرکەوێ، ئەنجامەکەیشی مردن، سەقەت کردن و

پەکخستنی مرۆڤە لەبەردەوامبوونی ژیان، پەکخستن لەبەرهەمهێنان، پەکخستن لەزیادبوونی وەچەی مرۆڤ، دروست کردنی ترس و ڕاڕایی لەناو خەڵکیدا، تا لەو ناوچانەدا نەژین. بەگوێرەی ڕاپۆرتی ئەنجومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی UN، بە ملیۆنان مین لە ناوچەکانی کوردستاندا چێندرابوون، تەنیا لە شاری سلێمانی لە مانگی ئازارەوە تا ئەیلولی ١٩٩١ لە نەخۆشخانەکاندا (١,٦٥٢) هەزار و شەش سەد و پەنجاو دوو بریندارى مین هەبوون. ئەو مینانە بەبێ نەخشەی دابەشکردن و بەبێ دیاریکردنی جێگاکانیان لەو ناوچانەشدا کە خەڵکی مەدەنی تێدا دەژین و تەنانەت دووریش بوون لە سنووری شەڕی عێراق-ئێرانەوە دانرابوون، بەجۆرێکی وایش، بەکەرەسەی ئاسایی نەدۆزرانەوە، بۆیە ئەنجامەکەی هەزاران قوربانی و خەڵکێکی زۆر پەککەوتەو سەقەتبوو مانەوە[١٠٧].

تاوانی جینۆساید، وەکو پێشتر ڕوونمان کردەوە، لە گەڵێ بەڵگەنامەی ڕژێمی فاشی عێراقدا جێگیر کراوە. علي حسن المجيد، سەرپەرشتکاری ڕەسمی هێرشەکانی ڕژێم لە کوردستاندا، لە کاسێتێکدا دەڵێ: (تەنیا ڕێگە بۆ ئازادکردنی خێزانی بەند و گیراوە کوردەکان، زیندەبەچاڵ کردنیانە)[١٠٨].

لە نووسراوێکی نهێنی بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی دهۆک ژمارە/٤٨ لە ١٩٩١/٣/٦دا لەخاڵی ٣/ و ٤/دا داوای کۆنترۆڵکردنی شاری دهۆک دەکات لەکاتی کۆبوونەوە یا ڕاپەڕینی جەماوەردا، بەو مەرجەی کە سوپا بەکاربهێنرێ و گەمارۆی خەڵکەکە بدرێ و چاودێری بکرێن. لە هەمان نووسراودا فەرمان دراوە کە ٩٥٪ی بەشدارانی ئەو کۆڕو کۆبوونەوە یا خۆپیشاندانانە ئیعدام بکرێن و ٥٪ی بۆ وەرگرتنی زانیاری بهێڵرێنەوە[١٠٩].

لیژنەی نەهێشتنی جیاوازی ڕەگەز لە UN لە کۆبوونەوەی چواردەهەمینی خۆیدا لەجنێڤ لە ٥-١٩٩١/٨/٢٣، داوای لە نوێنەری عێراق کرد کە وەزعی کورد لە عێراق و ژمارەی ئەو کوردانەی لەکاتی جەنگی عێراق-ئێراندا ڕایان کردووە ڕوون بکاتەوە، هەروەها لیژنەکە داوای کرد کە نوێنەری عێراق باسی پاراستنی ماڵ و سامان و ژیانی کورد بکات و باسی ئەو توند و تیژییەش

بکات کە لە دژی کورد و شیعەکان بەکاردەهێنرێ. لە ئەنجامدا، نوێنەری عێراق ڕایگەیاند کە وەفدی عێراق ناتوانێ وەڵامی پرسیاری سیاسی بداتەوە..![١١٠].

لەدوای ڕاپەڕینەکانی ١٩٩١ـەوە کە ڕژێم کۆنترۆڵی لەدەست دا و لە زۆربەری ناوچەکان کشایەوە، ئیتر گەمارۆیەکی ئابووری خستە سەر کوردستان و ڕێگە بەکەرەسەو پێویستییەکانی ژیان نەدرا کە بگەنە کوردستان. بۆ جێبەجێ کردنی ئەو سیاسەتەش هەموو جۆرە ڕێگایەک دەگرێتە بەر. تاوانێکی سەیر و تەواو فاشیانەی ڕژێم ئەوەبوو ڕۆژی ١٩٩٢/٤/١٥، چەند منداڵێکی لە سەیتەرەی کەرکووک-سلێمانی گرت، کە شتومەک و خواردنیان پێ بوو، سەرباری گرتنەکە ئەو منداڵانەیان لە حەوزی بەنزین هەڵکێشا[١١١].

پەرلەمانی ئەورووپی، لە بڕیارێکی تایبەتدا دەربارەی مافەکانی گەلی کورد کە لە ١٩٩٢/٦/١٢ دا بڵاوی کردووەتەوە؛

١- پشت بە بەڵگەنامەکانی پێشووی خۆی و بەڵگەنامەکانی نێونەتەوەیی دەبەستێ و گەمارۆی ئابووری لەدژی گەلی کورد مەحکوم دەکات.

٢- داوا لە ١٢ وڵاتی ئەورووپا دەکات کە هەوڵی بەپەلە بدەن بۆ جێبەجێ کردنی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی UN لە عێراق.

٣- داوا لە UNو وڵاتانی کۆمەڵەی ئەورووپی دەکات کە چاودێری لەمافی گەلی کورد لەئاستی نێونەتەوەییدا بکەن.

٤- داوا دەکات کە چاودێرانی UN لە عێراقدا بەردەوام بن کە بەگوێرەی بڕیاری ژمارە (٦٨٨)ی UN، زۆنی ئاسایش-یان پێک هێناوە.

٥- یارمەتی کورد و شیعەکان بدرێ لەڕووی مرۆییەوە.

٦- لە مەسەلەی ئەو مینانە بکۆڵدرێتەوە کە عێراق لەدژی خەڵکی مەدەنی چاندوونی[١١٢].

ئەو فاکتانەی کە خستمانە ڕوو بەشێکن لە سیاسەتی جینۆسایدی ڕژێمی

عێراق لەدژی گەلی کورد، ئاماژە کردن بەو ڕووداوانەو ئەو بەڵگە جیهانییانە دەمان گەیەننە ئەو ئەنجامەی کە؛

١- کوشتاری بەدەنی بە کۆمەڵی خەڵکی کوردستان کراوە، بەئیعدامکردن، گوللەباران کردن، بەکارهێنانی ئامرازی جەنگ، بەتایبەتیش چەکی قڕکەری کیمیاوی و ژەهر.

٢- کوردستان وێران کراوە و دانیشتوانی بەکۆمەڵ ڕاگوێزراون.

٣- کوردستان لە مرۆڤ و ئاژەڵ قەدەغە کراوە و سیاسەتی تەعریب کردنیش بەرنامەرێژ کراوە.

٤- وێرانکردنی دێهاتەکان و جێگە دێرین و مێژووییەکان، بووەتە هۆی فەوتاندنی کەلتووری نەتەوەیی.

٥- ئابووری کوردستان وێران کراوەو گەمارۆی ئابووریش خراوەتە سەر گەلی کورد.

٦- بار و زرووفێکی تایبەت و سەخت دروست کراوە، بەتایبەتیش دروستکردنی ئۆردوگاری زۆرەملێ و گەمارۆدانی خەڵکێکی زۆر لەو شوێنانە وەزعێکی نائارامی لەو ئۆردوگایانەو لە تەلبەندەکاندا لەنێوان ڕاگوێزراوەکاندا دروست کردووە، کە بووەتە هۆی کەم بوونەوەی ژمارەی خەڵکی.

٧- کەلتوور و شارستانییەتی کورد وێران کراوەو سیماو خەسڵەتی نەتەوەیی لە کوردستان شێوێندراوە.

٨- پیاو و ئافرەتان لەیەک دابڕێندراون، هەروەها منداڵانیش لەدایکان، بەتایبەتی لەماوەی ئەنفالەکاندا.

پێویستە ئەوە بڵێین، لە جێبەجێ کردنی سیاسەتی جینۆساید، نەخشەی درێژخایان کێشراوە و جیاوازیش نەکراوە لەنێوان خەڵکی مەدەنی و کەسانی چەکداری بزووتنەوەی کورددا، هەر بۆیەش لەگەڵ ڕاگواستن و وێرانکردنی دێهاتەکانی کوردستاندا، تاڵان کراوە، خەڵکێکی زۆر بێ سەر و شوێن کراون،

بەمناڵ و ئافرەتیشەوە، کانیاوەکان پڕکراونەتەوە، داری بەردار سووتێنراون و ژەهرڕێژ کراون. دەغڵ و دان و باخ و بێستان سووتێنراون، ژینگە وێران کراوەو لەوتێندراوە، ئۆردوگای زۆرەملێ دروست کراون و خەڵکەکەی لەژیانێکی سەخت_دا ژیاون، ئەنجامی گەلێ خراپی دروست کردووە، شێتی، تێکچوون، دزی کردن، بێ ئیشی، تاوانکاری، بێ ناموسی، خۆفرۆشی، دروستبوونی وەزعێکی نائاسایی کە بووە بەهۆی تێکچوونی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی جاران و لەدەستدانی کەلتووری میللی و پەیوەندی کۆمەڵایەتی، دەکرێ پێی بووترێ مردنێکی لەسەرخۆی خەڵکەکە.

ئەم فاکتانە بەشێکی کەمن لە مێژوویەکی دوور و درێژی تاوان و وێرانکاری و خوێن ڕشتن، لێرەشدا، زیاتر ئەو ڕووداوانەمان تۆمار کردووە کە خەڵکی کوردستانی بەگشتی گرتووەتەوە، ئەوە هەمیشە ئەوانەی لە ریزی هێزە سیاسییەکانی کوردستاندا یا لە ریزی سەرجەمی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقدا کاریان کردووە، خۆیان بەمەرگ مەحکومن، کەس و کاریشیان یان بەگرتن یان دەرکردن.

## فاكتى تاوانى جینۆساید له باكوورى كوردستان

لەو میللەتانەی کە لە خوارووی ڕۆژئاوای ئاسیا دەژین، کورد کۆنترین میللەتی ئەو ناوچەیەیە، هەر وەکو، ڕۆژهەڵاتناس م. س. لازەریف دیاری کردووە، دەرکەوتنی کورد لەو ناوچانەدا لەپێش تورک و عەرەبەوەیە هەر بۆیەش کورد بەشێکە لە ڕووداوە جەنگی، سیاسی و کەلتوورییەکانی ناو ئیمپراتۆری و حکوومەتە تازەکانی ئەو ناوچەیە[١١٣].

لە ساڵی ١٩١٩دا مێجەر نوئێل لە ناوچەکانی باکووری کوردستاندا گەشتی کردووە، لەباسی خانووبەرەی کوردیدا دەنووسێ، کە؛ (کورد خاوەنی چێژو شارستانیەتێکی دێرینی ڕەسەنە)[١١٤]. زاناو سۆسیۆلۆگی تورک، دۆستی دڵسۆزی گەلی کورد ئیسمایل بێشکچی کە سەرجەمی ژیانی خۆی بۆ داکۆکیکردن لە گەلی کورد تەرخان کردووە، دەڵێ؛ (هەوڵی تەواو و توند بۆ خنکاندنی پێناسەی نەتەوەیی کورد بەبەردەوامی دەدرێت. هەروەها بۆ کردنیان بە کۆیلە و ئینجا سڕینەوەی نازناو و کەلتوور و شارستانێتی و زمانیان لەسەر پەڕەی مێژوو و سەر زەمین)[١١٥]. بێشکچی، هەر لەبارەی فەوتاندنی گەلی کوردەوە دەڵێ؛ (لە تورکیا نەتەوەی کورد هێندەی نکۆڵی لە بوونی خۆی و پێناسەی نەتەوەیی خۆی بکات دەتوانێت بە ئازادییە لاوەکییەکان شاد بێت و سوود لە پرنسیپی مامەڵەی یەکسان وەربگرێت)[١١٦].

کەواتە، کێشەی کورد لەوەدایە، وەکو میللەتێکی سەربەخۆ بوونی هەیە، بۆیە سیاسەتی وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان بەپلەی یەکەم نەهێشتنی بوونی نەتەوەیی کوردە، ئیتر بە هەر هۆ و بە هەر ئامرازو ڕێگایەک بێت. ئالێرەوە، ئەو خاڵە گرنگە دەستنیشان دەکرێ کە ئەو تاوانانەی لەدژی گەلی

کورد دەکرێن، تاوانی جینۆسایدن، لە تاوانی ئاسایی جیا دەکرێنەوە، کە مەبەستەکە نەهێشتنی بوونی نەتەوەییە، دیارە ئەو نەهێشتنەش، هەر فەوتاندنی بەدەنی نییە، بەڵکو نەهێشتنی کەلتووری نەتەوەیی و هەموو سیما و دیاردەیەکە کە بوونی سەربەخۆیی میللەتی کورد دیاری دەکات.

بەندی (٦٩)ی یەکەم دەستووری تورکیا لە ١٩٢٤دا، ئەو بیر و ڕایە لە چوارچێوەی یاسادا دەچەسپێنێ و دەبێتە دەستووری وڵات لەدژی گەلی کورد، کە دەڵێت: (هەموو تورکان یەکسانن لەبەردەم یاسادا)[١١٧]. بەگوێرەی ئەو بەندە، دوو جۆر مانا لێک دەدرێتەوە، یا تەنیا تورکان یەکسانن لەبەردەم یاسادا، یا ئەوەتا جگە لە تورک، لە چوارچێوەی سنووری سیاسی-یاسایی تورکیادا هیچ گەل و نەتەوەیەکی تر نییە. ئەمەش وا نیشان دەدات بەگوێرەی دەستووری تورکیا، تەنیا تورک لە تورکیادا دانی پێدا دەنرێ و مافی ژیانی هەیە. کەواتە نە کورد بوونی هەیە و نەکوردستانیش دانی پێدا دەنرێ، هەر بۆیەش بەندی (٦٩)ی دەستووری یەکەمی تورکیا وا دیاری دەکات ئەوەی بەڕەچەڵەک تورک نەبێت مافی یەکسانی نییە لەبەردەم یاسادا. ئەمە ڕێگە خۆش دەکات بۆ هەموو کارێکی ناڕەوا (بە یاسایش دابنرێ) لەدژی ئەوانەی کە تورک نین لە تورکیادا.

زمان، هۆیەکی گرنگی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و جیاوازی نەتەوەییە لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا، بوونی زمان، بوونی نەتەوە دەسەلمێنێت. لە سییەکاندا، دەزگاکانی پۆلیس لە تورکیا، تەرخان کرابوون بۆ چاودێری کردنی جوتیارە کوردەکان، لە هاتوچۆی شارەکاندا تا بزانن بە چ زمانێک قسە دەکەن، ئەگەر بەکوردی قسەیان بکردایە، دەبوایە بەرامبەر هەر وشەیەک (٥) قروشیان باجی ئەو تاوانە بدایە کە کوردن. جاری وا هەبوو ئەو باجەی دەیاندا زیاتر بوو لەپارەی ئەو شتومەکانەی کە هێنابوویان بۆ فرۆشتن[١١٨].

بەڵگەنامەیەکی گرنگی پشکنەری گشتی تورکیا ئابدین ئوسمان، دەربارەی ستراتیژی تواندنەوەی کورد و نەهێشتنی تایبەتمەندی نەتەوەیی کورد لە کوردستانی ژوورودا، لە ئەرشیفی بەریتانیادا پارێزراوە، ئەو ڕاپۆرتە لە

چلەکاندا ئاڕاستەی وەزارەتی کاروباری ناوخۆی تورکیا کراوە. ناوەڕۆکی ئەو ڕاپۆرتە، داڕشتنی سیاسەتێکی تایبەتی ناوخۆی ویلایەتەکانی بتلیس، دیاربەکر، وان، هەکاری، موش، ماردین، ئورفەو سیرتە کەبریتییە لەپرۆژەیەکی کۆلۆنیالانەی درێژخایان بۆ نەهێشتنی بوونی نەتەوەیی کورد، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- نیشتەجێکردنی کۆچەرە تورکەکان، لە ناوچەکانی کوردستاندا، بەو مەرجەی هەر ساڵەی ٢-٥ دێهاتی تورک نشینی سەد ماڵی دروست بکرێ، چونکە مەسەلەی تورکاندن و تواندنەوەی گەلێکی دواکەوتووی نەخوێندەوار لە بووتەی گەلێکی ڕووناکبیر و پێشکەوتوودا ئاسانتر دەکا.

٢- دوورخستنەوەی منداڵانی کورد لەدایک و باوکیان و کۆکردنەوەیان لە فێرگەی شەوانەی تایبەتداو مامۆستای لێوەشاوەو کارامەیان بۆ دابنرێ بۆ ئەوەی بە گیانی تورکیزم و تورکپەروەری پەروەردەی تەواو بکرێن و زمانی تورکی بکرێتە تاکە زمانی ئاخاوتن و بەرنامەی تایبەتیان بۆ دابنرێ. ئەمەش بەزۆر ڕاگواستنی منداڵانە لە کۆمەڵگەی کوردەوە بۆ کۆمەڵگەی تورک. (بڕوانە: بەندی دووەمی پەیماننامەی ١٩٤٨ دەربارەی قەدەغەکردنی جینۆساید و سزا خستنە سەر تاوانکارانی).

٣- پرۆسەی تواندنەوە: بریتییە لە، جێبەجێ کردنی دەسەڵاتی ئابووری تەنیا بۆ ئەو کەسانەی کە وازیان لە کوردایەتی هێناوە، هەروەها گەڕانی لێپرسراوانی دەوڵەت بەدێهاتەکانداو هاندانی فەرمانبەر و سەربازەکان کە ژنانی کورد بخوازن، دەوڵەتیش بۆ ئەم مەبەستە زەوییان بەسەردا دابەش دەکات بۆ ئەوەی لەناوچەکاندا جێگیر بن.

٤- زمانی کوردی قەدەغە بکرێ و ئەوەی کاری بکەوێتە دائیرەکان دەبێ وەرگێڕ لەگەڵ خۆیدا بهێنێت[١١٩].

تاوانی جینۆساید لە باکووری کوردستان، هەموو لایەنەکانی ژیانی کوردی گرتووەتەوە. لەڕووی تیۆرییەوە، لە یاساکانی ناوخۆدا، گەلی کورد لە تورکیا

بوونی نییە، لە پراکتیکیشدا، سوپا و پۆلیس و دەزگاکانی دەوڵەت هەموو توانایەکیان خستووەتە کار لەدژی گەلی کورد، گرتن، تۆقاندن، ئیعدامکردن، بەکۆمەڵ ڕاگواستن، فەوتاندنی کەلتوور و تایبەتمەندی نەتەوەیی. لەم ڕووەوە ئیسمایل بێشکچی دەڵێ:

(ئەو بڕیارە یاساییانەی دەرهەق بەمەسەلەی کورد دەدرێن، لە دادگا باڵاکانی تورکیا وەکو دادگای بەرزو ئەنجومەنی دەوڵەت و دادگای ڕەتکردنەوە، بڕیاری یاسایی نین، بەڵکو بڕیاری سیاسین. بەگوێرەی یاسای دەوڵەتی تورکیاش، کۆماری تورکیا، بەخاک و گەلەوە یەکگرتووەو قابیلی دابەشبوون نییە، بەمەش دەزگا یاساییەکانی تورکیا بوونی میللەتی کورد ڕەت دەکەنەوە، کەواتە واقیعێکی ڕاستەقینە ڕەت دەکەنەوە)[١٢٠]. ڕاستی ئەم بیر و ڕایەی بێشکچی لە یەکەم دەستووری تورکیادا/ ساڵی ١٩٢٤/ چەسپێندراوە.

بەندی ٨٨ دەڵێ:

(هەموو دانیشتوانی تورکیا بەبێ ڕەچاوکردنی ڕەچەڵەکی ئاینی و ڕەگەز، تورکن)[١٢١]. بەگوێرەی ئەم بەندەش، لەڕووی یاساوە، هەموو هاووڵاتیانی تورکیا تورکن، کەواتە ئەم بەندە یاساییە، بوونی هەر نەتەوە یا گەلێکی تر یا کەمە نەتەوەیی جگە لە تورک لە تورکیادا ڕەفز دەکات و هەموویان بە تورک پێناسە دەکات. کوردیش گەورەترین بەشی نیشتمانەکەی و زۆرترین ژمارەی بە تورکیاوە لکێندراوە لەچوارچێوەی سنووری یاسایی و سیاسی تورکیادایە. ئەم ئایدیایە، بە یاساکردنی سیاسەتێکی کۆلۆنیالیانەیە بۆ هەڵلووشینی گەلی کورد بە خاک و مێژووەکەیشیەوە. هەر بۆیەش ئەو وڵاتانەی کە کوردستانیان داگیر کردووە، (کاربەدەستانیان لووت بەرزانە و مەغروورانە دەڕواننە کورد) هەر لەو پێودانگەشەوەیە کە (ئەو فەرماندانەی کە دەسەڵاتی ناوەندیی لە کوردستاندا دایان دەمەزرێنێ، کەسانی ناسراون بە دڕی و توند و تیژی)[١٢٢]. دکتۆر مەجید جەعفەر ڕاستی بۆ چووە کە بیر و ڕای وایە: (هەموو دیاردەو پێگەی کۆلۆنیالیزم و پەیوەندی کۆلۆنیالییانە لە نێوان

دەسەڵاتی ناوەند و بەشەکانی کوردستاندان، ئەم بوارانەش، لایەنی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتووری و سەربازی و سایکۆلۆژی گرتووەتەوە)[١٢٣]. زیاتر بۆ دەرخستنی ئەو ڕایەی د. مەجید جەعفەر، ئاماژە بە وتەکەی وەزیری دادی تورکیا (لە ساڵی ١٩٣٠) دەکەین کە سەبارەت بە سیاسەتی کۆلۆنیالیانەی ناوەند لە بەرامبەر گەلی کورد دواوە و وتوویەتی: (کورد تەنیا مافی ئەوەی هەیە، ببێ بە خزمەتکار و ببێ بە کۆیلە)[١٢٤].

سیاسەتی ڕژێمی تورکیا، درێژە پێدانی هەمان سیاسەتی کەمالیستەکانە لە بیستەکاندا لەدژی گەلی کورد، هەر وەکو ڕۆژهەلاتناس گەسرەتیان دەڵێ: (لەدوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی کوردەکان لە ساڵانی ١٩٢٥-١٩٢٦دا، سەدان گوند وێران کران، هەزاران ماڵ سووتێنران، سەدان هەزاریش خەڵکی مەدەنی کوژران و ئاوارە کران، بەپیر و ئافرەت و منداڵیشەوە)[١٢٥]. لەلای ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان، ڕابەران و بەشدارانی بزووتنەوەی کورد خائینن، بۆیە دەبێ ئیعدام بکرێن. ڕژێمی تورکیا لە ٢٩/نیسانی ١٩٢٥دا شێخ سەعید و چل کەسی تر لە هاوکارانی لە دیاربەکر ئیعدام کرد[١٢٦].

١٩٢٥/٦/٢٥ هەندێ لەناودارانی کورد، نامەیەکیان ئاڕاستەی کۆمەڵەی گەلان کرد، تیایدا باسی جینۆسایدی گەلی کوردیان ڕوون کردبووەوە، کە چۆن حکوومەتی ئەنقەرە لەدژی گەلی کورد جێبەجێی دەکات، هەر وەکو چۆن پێشتر تورکیا لەدژی ئەرمەنەکان پەیڕەوی دەکرد[١٢٧]. سیاسەتی جینۆساید لە یاساکانی ڕژێمی تورکیادا جێگیر کراوە، ١٩٢٦/٥/٣١ ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانیی تورکیا یاسای ژمارە ٨٨٥ ی دەرکرد، بەگوێرەی ئەو یاسایەش، هێرش و پەلاماردانی سەر ناوچە کوردییەکان، کاری ڕەوان[١٢٨]. لە ساڵانی ١٩٢٥-١٩٢٦ ڕژێمی تورکیا، بەکۆمەڵ خەڵکی ڕاگواستووە و بەکۆمەڵیش خەڵکی کوردستانی کوشتووە، بەزستانێکی سەخت لە کاتی ڕاگواستندا خەڵکێکی زۆر لە برساو لە سەرما مردوون، هاوکاتیش دێهاتەکان سووتێنراون و وێران کراون، پرۆسەی تورکاندن و تورک نیشتەجێ کردنیش لە کوردستاندا بەردەوام بووە[١٢٩].

شۆڕشی ئاگری داخ کە لە ١٩٢٧-١٩٣١ی خایاند لەلایەن تورکیاوە زۆر دڕندانە سەرکوت کراوە، دیسانەوە کوردستان کەوتووەتەوە بەر شاڵاوی تاوانکاری:

١- سەرپاکی دانیشتوانی (٢٢٠) گوند قڕکران، کە نزیکەی (١٠,٠٠٠) دە هەزار کەس دەبوون.

٢- نزیکەی (١٠٠) سەد ڕووناکبیری کوردیان بەدەست و پێ بەستراوی فڕێ دایە دەریاچەی (وان)ـەوە.

٣- لە دەوروبەری ناوچەی تاندریک_دا، (٤٠٠) گوندیان وێران کرد.

٤- لە پارێزگای (وان)، (٨٢) گوندیان وێران کرد و (٥٩٠) پێنج سەد و نەوەد کەسیان کوشت[١٢٠].

ژەنراڵ ئیحسان نوری پاشا، لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا، باسی هێرشەکانی تورکیا دەکا و دەڵێ: (زۆربەی خانەوادەی پێشمەرگەکان لە گەلی (زیلان)دا دەبن، کە لەپشتەوە هێرش دەبەن، پێش ئەوەی دەستیان بە شۆڕشگێڕان بگات، سەرپاکی ئەو ژن و منداڵانە قڕ دەکەن)[١٣١]. دانیشتوانی ئەو گوندانەش کە بەتۆپ و فڕۆکە کاول کران، ئەوەی لە مردن ڕزگاری بوو، ژن و کچ و منداڵ، وەک ڕانە مەڕ دەدرانە بەر بۆ گوند و ناوچەکانی تورک و لەولاشەوە دەوڵەمەند و فەرمانبەرانی تورک، دەستیان درێژ دەکردە سەر ماڵ و موڵک و ناموسیان، هەر لەو ناوچانەدا، نزیکەی دوو هەزار کەسیان لە گوندی جیاجیای ئەو ناوە کۆ کردبووەوە و هەموویان هێنان و هەر بەزیندوویی خۆڵیان پیا کردن و زیندەبەچاڵ کران[١٣٢].

١٩٢٧/٦/١٥ ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانیی تورکیا یاسای ژمارە ١٠٩٧ی دەربارەی ڕاگواستنی کورد لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژئاوا دەرکرد. بەندی یەکەمی ئەو یاسایە دەسەڵاتی بەحکوومەت داوە کە لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتەوە (١٤٠٠) کەس لەگەڵ خێزانەکانیاندا ڕاگوێزن. هەروەها خێزانی (٨٠) هەشتا "یاخیبوو" لەگەڵ ئەو

کەسانەی کە تاوانبارن ڕاگوێزرێن. بەندی دووەمی هەمان یاسا داوا دەکات کە پرۆسەی ڕاگواستنەکە تا کۆتایی مانگی ئابی ١٩٢٧ تەواو بکرێت. بەگوێرەی یاسای ژمارە (١٠٩٧)، هەزاران خێزان بۆ ناوچەکانی ویلایەتەکانی ڕۆژئاوا ڕاگوێزران، لە کاتی ڕاگواستنیشدا سەروەت و ماڵێکی زۆریان لەدەست_دا[١٣٣].

ڕۆژهەڵاتناس ف. نیکیتین، دەربارەی سیاسەتی ڕژێمی تورکیا ئەوە دیاری دەکات کە لەساڵانی ١٩٢٦-١٩٢٧دا، نزیکەی یەک ملیۆن پیاو و ئافرەت و مناڵی کورد بۆ ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ ڕاگوێزراون، ڕاگواستنەکەش زۆر بەتوندی و خراپی جێبەجێ کراوە، هەر وەکو چۆن لە سەردەمی جەنگی یەکەمدا لەگەڵ ئەرمەنەکاندا ڕەفتار کراوە[١٣٤].

١٩٢٧/٦/٢٥ ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانیی تورکیا یاسای ژمارە (١١٦٤)ی دەرکرد. ئەم یاسایەش ڕاستەوخۆ لەدژی کورد بوو، کە دەسەڵات بە ئەنجومەنی وەزیران دەدات بۆ دروستکردنی زۆنێکی تایبەت لەم ناوچانەدا:

ئیلیازیز، ئورفە، بیتلیس، هەکاری، دیاربەکر، سییرت، وان و ماردین. ئەو زۆنەش (ناوچەی ئارام) دەبێت لەژێر کۆنترۆڵی بەڕێوەبەرایەتییەکی تایبەتیدا بێ و سیاسەتێکی تایبەت لەدژی ئەو ناوچانەی کوردستان بەکار بهێنرێ[١٣٥].

لەڕاستیدا تاوانەکانی ڕژێمی تورکیا لەدژی گەلی کورد ئەوەندە زۆر و بەرفراوانن، کە دەقاو دەق لە چوارچێوەی سیاسەتی فەوتاندنێکی سەراپاگیری (کورد وەکو نەتەوە)دا جێگیر دەبێ، ئەمەش لە یاسای تازەی نێودەوڵەتاندا بە جینۆسایدی هەمە لایەنە دیاری دەکرێ.

دکتۆر بلەج شێرکۆ ژمارەی وێرانکاری و ماڵی سووتاوو ژمارەی کوژراو لە ١٩٢٥-١٩٢٨ لە (٢١٢)گوند دا بەم جۆرەی لای خوارەوە دیاری دەکات:[١٣٦].

| ناوی ناوچه | ماڵی سووتاو | ژمارەی کوژراو |
| --- | --- | --- |
| لیچه | ١١٦٤ | ٦٤١٣ |
| دارهینی | ٢١١٠ | ٩١٤ |
| ئەردوشین | ١٤٥ | ٢٩٥ |
| جباقچور | ٥٧١ | ٢٦٠ |
| نسیبین | ٢٣٥ | ٥٤ |
| جباب | ٧٣٥ | ٩٠٢ |
| ئەلیان | ٧٩٠ | ١٣٧١ |
| مدیان | ٤٥٠ | ٦١٣ |
| باجەرین | ٥٦٣ | ١٠١٥ |
| کربوران | ١٠٩ | ٢٤٣ |
| دیاربەکر | ١٣٨ | ١٧٦ |
| کنج | ١٢٢٣ | ١٥٢٩ |

١٩٣٠/١/١، ڕژێمی تورکیا بڕیاری بەزۆر کۆچ پێکردنی دانیشتوانی ناوچەکانی دەرسیمی دەرکرد. بەگوێرەی هەمان بڕیار هەموو کەرەسەو شتومەک و کەلوپەلێک لەو ناوچانەدا ماونەتەوە دەستیان بەسەردا دەگیرێ و ڕژێم دەیانبات[١٣٧]. لەمانگی مایسی ١٩٣٠، ڕژێمی ئێران، ڕێگەی دا کە سوپای تورکیا بەناو سنووری ئێراندا بڕوات و پشت لە شۆڕشگێڕانی کورد بگرێت، هێرشەکان دەکرانە سەر خەڵکی مەدەنی و چەکداریش، بەگوێرەی ڕاگەیاندنی تورکیا خۆی زیاتر لە (٣,٠٠٠) سێ هەزار کورد کوژراون، تەنیا لە دۆڵی زیلان_دا (١٥٥٠) کەس بەکۆمەڵ کوژران. لە ناوچەی ئەرجیش (٢٠٠) گوند سووتێنران و تاڵان کران[١٣٨]. شایانی وتنە لەو هێرشانەدا، سوپای تورکیا لە ئێران و عێراق و سوریاوە پەلاماریان داوە. بەشداریکردنی ئێران و عێراق و سوریا لەگەڵ تورکیادا، خاڵێکی هاوبەشە لە بەجێگەیاندنی

تاوانی جینۆسایددا، بەشداری کردنیش، هەروەکو تاوانکار دیاری دەکرێت. ڕاپۆرتێکی سەفیری بەریتانی لە ئەستەنبوڵ لە ئابی ١٩٣٠دا دووپاتی هاوکاری نێوان حکوومەتی عێراق و بەریتانیا و خۆشحاڵی تورکیا دەکات لەدژی بزووتنەوەی ڕزگاری کورد لە عێراق[١٣٩].

بەگوێرەی زانیاری گۆڤاری (زاریا فەستۆکا) لە ٢٠/٣/١٩٣١دا، کە بڵاوی کردووەتەوە، هێرشەکانی تورکیا بۆ سەر کوردستان (١٠,٠٠٠-١٥,٠٠٠) قوربانی کوردی بووە، کۆمەڵەی (خۆیبوون)یش ڕایگەیاندووە کە(٦٦٠) گوند وێران کراون و (١٥,٢٠٦) ماڵ سووتێنراون[١٤٠].

لە ٥/٥/١٩٣٢، حکوومەتی تورکیا بە ڕەسمی ڕایگەیاند، یاسایەک دانراوە ڕێگا دەدات لە ناوچەکانی ڕۆژئاواوە خەڵکی کۆچ پێ بکا، بەگوێرەی ئەو یاسایە، ڕاگواستن، قەدەغەکردنی زمانی کوردی، فەوتاندنی تایبەتمەندیی کوردەواری، جێبەجێ دەکرێن. ئەگەر چی لەپێش ئەو یاسایەشدا، لە ئەیلولی ١٩٣١(٢,٠٠٠) دوو هەزار کورد لەگەڵ مەڕو ماڵاتیاندا بە وەزعێکی زۆر ناخۆش ڕاگوێزران و لە ناوچە تورکییەکاندا نیشتەجێ کراون هەمان کات لە جێگەی ئەو کوردانە تورک نیشتەجێ کراون[١٤١]. بەگوێرەی ئەو یاسایە، سەدان هەزار کورد لە ناوچەکانی خۆیانەوە ڕاگوێزران، دەشبێ نیشتەجێکردنی ئەو ڕاگوێزراوانە بە جۆرێک بێت لە هەر ناوچەیەک کە جێگیر دەکرێن نابێ لە ٥٪ زیاتری دانیشتووان پێک بهێنن. هەروەها نابێ بگەڕێنەوەو گوندەکانی خۆیان ئاوەدان بکەنەوە یان هەوڵ بدەن ڕێکخراو پێک بهێنن[١٤٢]. بەجێبەجێ کردنی ئەو یاسایە، ڕژێمی تورکیا (٢٥,٠٠٠) سەربازی خستە کار کە ئەو بەتازەترین چەک و کەرەسەی جەنگی پڕچەک کرابوون. لە ئەنجامی ئەو هێرش و کارانەشدا (٤٠٠) دێی کوردستان وێران کران. ئیتر بەگوێرەی خاڵی (٩)ی ئەو یاسایە (بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران، وەزیری کاروباری ناوخۆ بۆی هەیە ئەو کوردانە ڕاگوێزێ کە هێشتا لەناو ڕەگەزو فەرهەنگی تورکدا نەتوانەتەوەو لە نێو تورکە ڕووناکبیرەکانی ناوچە بەفەرهەنگ ئاشناکانی تورکیادا نیشتەجێیان بکا...)[١٤٣].

ڕژێمی تورکیا له دیسهمبهری ۱۹۳٥دا بڕیاری ژماره (۲۸۸٤)ی دهرکرد، ئیتر به گوێرهی ئهو یاسایه والی گشتی ناوچهی دهرسیم دهسهڵاتی وهزیری پێ درا، ئهگهر چی له تورکیا تهنیا پهرلهمان بۆی ههیه بڕیاری خنکاندن بهسهر هاووڵاتییاندا بسهپێنێ، بهڵام له کوردستان والییهکان دهسهڵاتی خنکاندنی هاووڵاتیانیان ههیه. بهگوێرهی ئهو بڕیارهش، کورد بۆی نهبوو نه له سوپا و نه له کارگه و کۆمپانیاکاندا کاربکات[١٤٤].

تاوانی جینۆساید، گهیشته ئهو ئهندازهیه که ڕژێمی تورکیا له ۱۹۳۷دا بۆ یهکهم جار بۆمبای ژههراوی لهدژی کورد بهکارهێنا ئیتر ئهنجامی تاوانهکان له نێوچوونی نیو ملیۆن مرۆڤی کورد بوو[١٤٥].

له دوای سهرکوتکردنی ڕاپهڕینی دهرسیم له ۱۹۳۷دا، کهمالیستهکان به ئاگر و ئاسن بهربوونه گیانی خهڵکی کوردستان، (۱,٥۰۰) پیرهژن و ئافرهت و منداڵ بهسترانهوهو چاڵێکی گهورهیان بۆ ههڵکهندن، نهوتیان بهسهریاندا کرد و ئاگریان تێ بهردان. بزووتنهوهی نیشتمانی خهڵتانی خوێن کرا، بهر دهرگای ئهو ئهشکهوتانهیان ههڵچنی که ههزاران خێزانی کورد (ئافرهت و منداڵ و پیر و پهککهوته) خۆیان تیا شاردبووهوه بهتێپهڕبوونی ڕۆژگاریش مهرگ و برسێتی تهنگی پێ ههڵچنین و ههموویانی کوشت، ئهنجامیش (٤۰,۰۰۰) چل ههزار مرۆڤی کورد شههید کران[١٤٦].

وڵاته داگیرکهرهکانی کوردستان (تورکیا، عێراق، ئێران و سوریا)، ههرچی ناکۆکییهکیش لهنێوانیاندا ههبێت، لهسهر لێدانی بزووتنهوهی کورد و وێرانکردنی کوردستان ههمیشه تهبا و هاوبهشن. گهلێ ڕێکهوتننامه و پهیماننامه ههیه لهنێوانیاندا که مهبهستی سهرهکییان بهربهندکردنی بزووتنهوهی کورد و سهرکوتکردنی خهباتی نهتهوایهتییه بۆ ئازادی. دهتوانین ههر له بیستهکانهوه تاکو ئهم سهردهمه دهستنیشانی گهلێ ڕێککهوتننامه و پهیماننامهی دوو قۆڵی و چهند قۆڵی بکهین که تورکیا بهشداربووه تیایاندا.

٥/٦/١٩٢٦ بهریتانیا و عێراق و تورکیا ڕێککهوتننامهیهکیان مۆر کرد، که بهندی (۱۲)ی تورکیا و عێراق پابهند دهکات بکهونه کار لهدژی ههر

بزووتنەوەو ڕێکخراوێک لە هەر یەکێک لە ناوچە سنووریەکانی هەردوو لایاندا سەر هەڵدەدات[١٤٧].

لە نیسانی ١٩٢٦ لە تاران، ڕێککەوتننامەیەک لە نێوان تورکیا و ئێراندا مۆرکرا، لە چەند بەندێک_دا هەردوو دەوڵەت پابەند دەکات بەهاوکاری کردنی یەکتر بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوەی کورد. بەندی پێنجەمی، ئەو مەرجەی بۆ ئێران و تورکیا داناوە، ڕێگە بەهیچ دەستەو ڕێکخراوێک نەدەن کە لەهەر لایەکیانەوە بێت لەدژی لایەکەی دیکە[١٤٨].

١٩٢٦/٥/٣٠ پەیماننامەی دۆستایەتی لەنێوان تورکیاو فەرەنسادا مۆرکرا. ئەو کاتە سوریا لەژێر منداتی فەرەنسادا بوو، بۆیە ئەو پەیماننامەیە تورکیا و سوریا دەگرێتەوە. پرۆتۆکۆلی ژمارە (٨)ی پاشکۆی ئەو پەیماننامەیە لە بارەی چاودێری و کۆنترۆڵکردنی سنووری نێوان تورکیا و سوریایە. بەندی یەکەمی ئەو پرۆتۆکۆلە هاوبەشی کردنی هەردوو لایە لەدژی بزووتنەوەی کورد لە ناوچە سنووریەکانیاندا. بەندی سێیەمی، دەسگیرکردنی "تاوانبارانە"، مەبەستیش لە تاوانباران، بەشدارانی بزووتنەوەی کوردە لەهەر لایەکیان بێت. بەندی چوارەمیش، تایبەتە بە تەسلیم کردنەوەی"تاوانباران" کە سنووریان بڕیوە و لەدژی لایەنەکەی تر لەکاردان[١٤٩].

بە گوێرەی ڕێککەوتننامەی ١٩٢٦/٥/٣٠، لە ١٩٢٩/٦/٢٩دا تورکیاو سوریا لە ئەنقەرە پرۆتۆکۆلی چاودێری کردن و کۆنترۆڵ کردنی سنووری نێوان خۆیان مۆرکرد. بەگوێرەی بەندی دووەمی ئەو پرۆتۆکۆلە، هەردوو لا پابەندن بەوەی کە ڕێگە نەدەن لە سنوورەکانیاندا هیچ کارێک لەدژی لایەکەی دیکە ئەنجام بدرێ، هەروەها یەکتر ئاگادار بکەنەوە لەو چالاکیانەی کە لەسەر سنوورەکانیاندا لەدژی هەر لایەکیان هەبێت. بەگوێرەی بەندی سێیەمیش، هەردوولا دەبێ دەست بەکاربن لەدژی هەر چالاکییەک کە لەسەر سنوورەکانیدا هەبێ[١٥٠].

لە ١٩٣٢/١/٢٣ لە تاران، حکوومەتی تورکیاو ئێران پرۆتۆکۆلێکیان دەربارەی ناوچە سنوورییەکان مۆرکرد. پاشتر لە ١٩٣٢/١١/٥ دا هەردوولا

ڕێککەوتننامەی دۆستایەتییان مۆر کرد، کە لە ١٩٣٢/١٢/٢٨ دا بڕیاریان لەسەر دا، (تصدیق-Ratification کرا)، هاوکات لە ١٩٣٢/١/٩ لە ئەنقەرە پەیماننامەی نێوان تورکیاو عێراق مۆرکرا[١٥١].

سەرجەمی ئەو بەڵگەنامانە، مەبەستی سەرکوتکردنی بزووتنەوەی کورد و داخستنی سنوورەکان و تەسلیم کردنەوەی بەشدارانی بزووتنەوەکەیە. بۆ جێبەجێ کردنی ئەو ڕێککەوتننامانەش، بەشدارانی، هێزی زەمینی و ئاسمانی خۆیان بەکارهێناوەو دەستیان نەپاراستووە لە نێوان مەدەنی و چەکدارانی بزووتنەوەکەدا. بەو ڕێککەوتننامانە، ئەو وڵاتانە بەشدارن لەکار و تاوانی یەکتردا لەدژی گەلی کورد، نەک تەنیا بەشدارانی بزووتنەوەکە بەڵکو خەڵکی مەدەنی و دێهات نشینەکانی ناوچە سنوورییەکان بەر کەوتوون، لە هەموو شەڕو پێکدادانەکانیشدا ماڵ و سامانی خەڵکی ناوچە سنوورییەکانی نێوان ئەو وڵاتانە کە لەهەردوو دیوی ئەو وڵاتانەوە هەر خاکی کوردستانە، بوونەتە قوربانی و خەڵکەکە ماڵوێران بوونە.

سیاسەتی بەتورککردنی گەلی کرود (تورکاندن) و ڕاگواستن، بەشێکە لە ئایدیۆلۆژیاو ڕەفتاری حکوومەتی تورکیا لەدژی گەلی کورد. لە ماوەی نێوان ١٩٣٥-١٩٤٥، ڕژێمی تورکیا (٤٠٠,٠٠٠) چوار سەد هەزار کوردی ڕاگواستوە، ئەوەش ئەنجامێکی وای دروست کردووە لە ڕێژەی دانیشتوانی کوردستان زۆر کەم بێتەوە[١٥٢]. هەمان کات، بار و زرووفێکی سەختی دروست کردووە، کە کاری کردووەتە سەر کەلتوور و ئابووری و ژیانی کۆمەڵایەتی. ئەم سیاسەتەش لە کۆمەڵێ بڕیار و یاسای ناوخۆی تورکیادا بە ڕەسمی جێگیر کراوە. لە ١٩٦٧/١/٢٥دا حکوومەتی جەودەت سۆنای یاسایەکی دەرکرد، بەپێی ئەو یاسایە بەڕەسمی زمانی کوردی قەدەغە کرا. لەو ساتەوە، کتێب، ڕۆژنامە، بەڵگەنامە، قەوان، شریتی گۆرانی و مۆسیقای کوردی، قەدەغە کران[١٥٣].

دکتۆر مەجید جەعفەر، پشت بە بەڵگەنامەی نهێنی تورکی دەبەستێ و ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە لە ماوەی ساڵانی ١٩٦٥-١٩٧٠دا کۆچکردن (ڕەوکردن) لە

کوردستانەوە، ئەندازەی زیادکردنی ساڵانەی دانیشتوانی زۆر کەم کردووەتەوە. لە ماوەی بیست ساڵی پێشتر ئەندازەی زیادکردنی ساڵانەی دانیشتووان ٣٪ بوو، بەڵام لە ساڵانی ١٩٦٥-١٩٧٠ـەوە کەم بووەتەوەو ئەندازەی زیادکردنی (لەدایکبوون) ساڵانە بووە بە ١,٥٪. کۆچکردنیش لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا هۆی سەرەکی ئەو کەمبوونەوەیە[١٥٤].

دروستکردنی بار و زرووفێکی نائاسایی لە ناوچەکانی کوردستاندا، ئەنجامێکی ترسناکی داهاتووی هەیە لەسەر ئابووری و کەلتوور و بوونی کورد.

هەروەکو د. مەجید جەعفەر بەم جۆرە دیاری کردووە:

١- ڕەوکردن بووە هۆی، ڕۆیشتنی سەرچاوە مرۆییەکانی ناوچەکە، کە بەشێوەیەکی نەگەتیفانە کاردەکاتە سەر پێشکەوتنی کوردستان.

٢- ڕەوکردن دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئەو ستروکتورە باوەی خێزان کە هەیبووە. ئەنجامەکەشی کار دەکاتە سەر ستروکتوری کۆمەڵایەتی سەرجەمی کوردستان.

٣- ڕەوکردن دەبێتە هۆی تواندنەوەی کورد، چونکە دوور دەبن لە خاکی خۆیان و دەچنە ژینگەیەکی جیاواز کە ناچار دەبن ڕابردووی کەلتووری و داب و نەریتی خۆیان لەدەست بدەن.

٤- ڕەوکردن ئەنجامی سیاسی هەیە، چونکە ژمارەی کورد لەکوردستان کەم دەکاتەوەو دەبێتە هۆی فەوتاندنی بوونی نەتەوەیی و زیاتر زاڵبوونی حکوومەتی تورکیا[١٥٥].

لەدوای کودەتا سەربازییەکەی تورکیا (١٩٨٠)، ڕژێمی تازە بڕیاری دامەزراندنی (زۆنی ئاسایش)ی دا، بەدرێژایی ناوچە سنوورییەکانی سوریاو عێراق و ئێران. بەگوێرەی ئەو بڕیارە بە پانتایی ١٠-٢٠ کم خەڵکی ئەو ناوچانە لێیان قەدەغە کرا هیچ کاسبی و ئاژەڵدارییەک بکەن. بەبیانووی بەرهەڵستی ئاژاوەچییانەوە بە هەزاران دووکان و بازاڕیان لەم شارانە

داخست: گازی ئینتاب، دیاربەکر، کلیسیا، بەتلیس، بایەزید و گەلێ شاری تری کوردستان[١٥٦].

بەگوێرەی چاپکراوە کوردییەکانی دەرەوەی وڵات، لە ماوەی سێ ساڵی دوای کۆدەتا سەربازییەکەی تورکیا (١٧٠,٠٠٠) سەد و حەفتا هەزار کەس گیراون، (٢٠٠) دووسەد کەس بەئازار و ئەشکەنجە مردوون، (٧٠٠) حەوت سەد کەسیش بەهۆی هێرشی سەربازییەوە کوژراون، (٤٨) چل و هەشت کەس لە نەیارانی تورکیا ئیعدام کراون، زیاتر لە (١٧٠) سەد و حەفتا کەسی زیندان کراویش حوکمی ئیعدامیان دراوە، (٤,٦٠٠) کەسیش لەبەردەم دادگاکاندا چاوەڕوانی حوکمی ئیعدامن. پێویستە ئەوە بڵێین لەماوەی شەست ساڵی حوکمی کۆماری تورکیا، تەنیا (١١١) کەس بەهۆی سیاسییەوە ئیعدام کراون[١٥٧].

زانای ناوداری تورک سۆسیۆلۆگ ئیسمایل بێشکچی ئەو ڕاستییەی لە گەلێ لە نووسینە بەنرخەکانیدا ڕوون کردووەتەوە، ئەگەر یەکێک لەتورکیا پێ لەسەر ئەوە داگرێ و بڵێ کوردم، ئەوە وەکو ئەو کەسە وایە کە تاوانێکی کردبێ و دەبێ ئیعدام بکرێ[١٥٨]. ئەو ڕاستییەی کە بێشکچی باسی کردووە لە دەستووری کۆن و تازەی تورکیادا جێگیر کراوەو بەگوێرەی یاسای ناوخۆ گەلی کورد لە هەموو مافێکی بێ بەش کراوەو لە حاڵەتی داکۆکیکردنیشدا بەرەو مەرگ دەکرێتەوە.

کەنعان ئیفرین، سەرۆکی دەوڵەت لە گفتوگۆیەک لە ١٩٨١/١٠/٩، لە ڕۆژنامەی-شپیگل-دا، دەڵێ: (کوردەکان، چەند جارێک لە سەردەمی عوسمانییەکان و لە سەردەمی ئەتاتورکیشدا ڕاپەڕیون. پلانێکی شەیتانانە ڕێگەی لێ گرتووین).. هەروەها دەڵێ: (ئەوان ناتوانن هیچ لە ئێمە وەربگرن، ئێمە هەموو کارێک دەکەین بۆ ئەوەی ئەم کێشەیە لەڕەگ و ڕیشەوە هەڵکەنین)[١٥٩].

ڕژێمی تورکیا لە دەستووری تازەدا (١٩٨٢/١١/٧) هەر وەکو لە دەستووری پێشوودا مافی کوردی پێشێل کردووە، لەچوارچێوەی یاسادا

بوونی کورد پێشێل دەکات. هەر وەکو بەندی (٤٢)ی دەستووری ١٩٨٢ جگە لە زمانی تورکی هەموو زمانێکی تر قەدەغە دەکات لە دەزگاکانی خوێندن_دا. بەندی (٢٨)ی بڵاوبوونەوەی زمانە بەربەند کراوەکانیش قەدەغە دەکات[١٦٠].

ئەم بەندانەی دەستوور ڕەفزکردنەوەیەکی یاسایی زمانی کوردی و هەر زمانێکی ترە لە تورکیا جگە لە تورکی. ئەم سیاسەتە کۆلۆنیالیانەش کە (زمانی تورکی دایکی زمانەکانە)[١٦١]. بەتەواوی لە بواری پراکتیکدا کاری بۆ کراوەو پلان و نەخشەی جۆراو جۆری بۆ دانراوە. لە پرۆگرامی قوتابخانەکانی تورکیادا، منداڵانی کورد دەبێ، هەموو ڕۆژێک بڵێن:

ئەز تورکم

دایکم تورکە

باوکم تورکە

داپیرەم تورکە

باپیرەم تورکە

بنیادم تورکە[١٦٢].

ئاشکرایە، کە زمان یەکێکە لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی بوونی نەتەوە. مەبەستی ڕژێمی تورکیا، فەوتاندنی ئەو ڕەگەزە بنچینەییەی بوونی نەتەوەی کوردە بۆ هەمان مەبەستیش تورکیا بەرنامە و پلانی بۆ زانایان و نووسەرانی سەر بە ڕژێمەکەی داناوە بۆ ئیسپاتکردنی ئەوەی کە زمانی کوردی دیالێکتێکی زمانی تورکییە. ئیتر بەبیر و ڕای حکوومەتی تورکیا، ئەوەی وا دابنێت کە زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆیە، مەترسییە لەسەر یەکێتی و ئاسایشی تورکیا[١٦٣]. بەو جۆرە ڕژێمی تورکیا مێژوو و ڕەچەڵەکی کورد دەشێوێنێ و مێژوویەکی ساختە دروست دەکات.

لە ئاهەنگێکی فۆلکلۆری جیهانیدا لە شاری میونیخ لە ئەڵمانیا لە٦ ١١/-١٩٨٥/٨، کە نزیکەی (١٠٠) تیپی فۆلکلۆری گەلانی جیهان بەشداربوون، کاتێک کە تیپێکی کوردی لە شاری نۆرنبێرگەوە هاتبوو، هاتە سەر شانۆ،

سەفیری تورکیا لە بۆن و کونسوڵی تورکی لە میونیخ تووڕە بوون و ناڕەزایی حکوومەتی تورکیایان دایە حکوومەتی ئەڵمانیای فیدراڵی و دەستەی هەڵسووڕێنەری ئاهەنگەکە و داوایان کرد کە ئەو تیپە کوردییە ڕێگە نەدرێ، چونکە مەترسی لەسەر یەکێتی نیشتمانی و یەکێتی خاکی تورکیا دروست دەکات. لەبەرئەوەی داواکەیان زۆر ناڕەوا بوو، پشتگوێ خرا و تیپە کوردییەکە چالاکی خۆی پێشکەش کرد. سەیر لەوەدایە لەدوای ئەو ڕووداوە زۆربەی ڕۆژنامەکانی تورکیا لە دژی ئەڵمانیا وتاریان بڵاوکردەوەو وەزیری دەرەوەی تورکیاش لە ١٩٨٥/٨/٩دا ڕایگەیاند کە تورکیا ناڕازییە لەوەی وڵاتێکی دۆستی وەکو ئەڵمانیا ڕێگە دەدات ناحەزانی تورکیا چالاکییان هەبێت[١٦٤]. ئەم کارە تەنیا گوزارشت لەئایدیای فاشییانەی تورکیا دەکاو شەرمەزارییەکی گەورەیە بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا ڕژێمی وا لەدونیادا هەبێ، تەنانەت دژی فۆلکلۆری نەتەوەیەکیش بێت.

وەکو پێشتر وتمان بەندی (٨٨)ی یەکەم دەستووری کۆماری تورکیا ساڵی ١٩٢٤ دەڵێ: (هەموو دانیشتوانی تورکیا بەبێ جیاوازی ئاین و ڕەگەز، تورکن)[١٦٥]. لە تورکیادا، تەنیا تورک هەموو مافێکی هەیە. بەندی (٧٠)ی دەستووری ساڵی ١٩٨٢ـی تورکیا دەڵێ: (هەموو تورکێک مافی ئەوەی هەیە وەزیفەی حکومی هەبێت). بەندی (٦٦)یش دەڵێ: (ئەوەی هاونیشتمانێتی بە تورکیاوەی دەبەستێ، ئەوە تورکە)[١٦٦].

ئەم بەندانەی دەستووری تورکیا تەواو دژ و ناکۆکن لەگەڵ پرنسیپی یەکسانی و ڕێزگرتنی مافی مرۆڤدا. پێویستە بڵێین، ئیلتیزاماتی گشتی هەیە کە دەبێ یاسای ناوخۆ کۆک و گونجاو بێ لەگەڵ ئیلتیزاماتی نێونەتەوەییدا. بۆیە ئەو یاسایەی کە دەوڵەت دایدەنێت، ئەگەر ناکۆک بێ لەگەڵ ئیلتیزاماتیدا، ئەوا دەبێتە هۆی پێشێلکردنی ئەو ئیلتیزاماتە[١٦٧].

ڕەفزکردنەوەی مافی گەلی کورد لە یاساکانی تورکیادا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ئایدیۆلۆژیای ڕژێمی تورکیا لە تیۆری و پراکتیکدا لەسەر

ئەنجامدانی جینۆساید پێگەی داکوتا. لە هەشتاکانیشدا ڕژێمی تورکیا هەر وەکو درێژە پێدانی سیاسەتی جارانی، هاوکار بووە لەگەڵ وڵاتە داگیرکەرەکانی تری کوردستاندا. ڕێکەوتنی سەربازی نێوان تورکیاو عێراق لە بەهاری ۱۹۸۳دا، کە عێراق ڕێگەی دا سوپای تورکیا بچێتە ناوچەکانی بادینان، لە خوارووی کوردستان بۆ لێدانی هێزەکانی بزووتنەوەی کورد[۱٦۸]. ئەم ڕێکەوتنەش گەمارۆدانی هێزەکانی بزووتنەوەی کورد بوو لە هەردوو دیوی باکوور و باشووری کوردستان. ۱۹۹۰/٤/۹، ئەنجومەنی وەزیرانی تورکیا، بەسەرکردایەتی تورگوت ئۆزال، یاسای ژمارە (٤۱۳)ی دەرکرد، ئەمەش یاسایەکی نائاسایی بوو بۆ ناوچەکانی کوردستان کە بەبێ بڕیاری پەرلەمان دەرکرا و بەگوێرەی ئەو یاسایە بەرپرسیاری کاروباری سەربازی، حاکمی تەواوی کوردستانە و دەسەڵاتێکی بەر فراوانی پێ دراوە، وەکو: ڕاستەوخۆ ڕاگواستن و داخستنی چاپخانە، شکات وەرنەگرتنی خەڵکی لەدژی یاسای (٤۱۳)، ڕاگواستنی دانیشتوانی گوندەکان بەبێ ئاگادار کردنەوەیان، سزای قورس خستنە سەر (جیاوازی خوازان)و گەلێ دەسەڵاتی تر[۱٦۹].

ڕژێمی تورکیا، کوردستانی کردووەتە سەربازگەیەکی فراوان و بەحوکمی چەک سیاسەتێکی ئاگراوی و سەختی لە دژی خەڵکەکە پێڕەو کردووە. بەتایبەتیش هەوڵ دەدات، خەڵکی دێهاتەکان چەکدار بکات لەدژی بزووتنەوەی ڕزگاری کوردی. لە جێبەجێ کردنی سیاسەتی میلیتاریزە کردنی کوردستاندا، خەڵکەکە بەر شاڵاوی تاڵان کردن و سووتاندن و گرتن و ئازاردانێکی بەردەوام کەوتوون و چواردەوری دێهاتەکان مینڕێژ دەکرێ. بۆ نموونە (۳۷٤) گوند لە دەوروبەری وان لە ماوەی سێ مانگی ساڵی ۱۹۸۹دا لە دانیشتوانی چۆڵ کراون. نزیکەی (۳۰,۰۰۰) سی هەزار کەس ئاوارە بوونەو ناچار پەنایان بردووەتە بەر شارەکان[۱۷۰].

لە تورکیا، نەک تەنیا کورد خۆی بەرشاڵاوی قڕکردن کەوتووە، بەڵکو هەر بڵاوکراوەیەکیش باس لە بوونی مەسەلەی کورد بکات دای دەخەن و بەرپرسیارانی زیندانی دەکەن، بۆ نەهێشتنی ناوی کورد تەنانەت ناوی

دێهاتەکانیش لە کوردییەوە دەکەن بە تورکی، بێ ئابڕوویی گەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی گۆرانی بێژێک هەر لەبەر ئەوەی گۆرانی بە کوردی وتووە داویانە بە دادگا[١٧١].

ڕێکخراوی جیهانی کیدری C. E. D. R. I.- کۆمیتەی ئەورووپی بۆ داکۆکیکردن لە پەناهەندە ئاوارەکان-کە بارەگاکەی لە سویسرایە، لە ١٩٨٢دا بڵاوی کردووەتەوە کە زیندانی دیاربەکر بۆ (٣٠٠) سێ سەد گیراو دروست کراوە، بەڵام (٥,٠٠٠) پێنج هەزار کەسی تێدایە، حوکمدانی بە کۆمەڵ بەشێکی گەورەی نەخشەی حکوومەتی تورکیایە بۆ ژێردەستەکردنی کوردەکان. کوردەکان بۆ نێوەندی نهێنی بەندکردن دەهێنن و ئەشکەنجەیان دەدەن تا ئیعتیرافی ئیمزاکراویان لێ وەربگرن و خەڵکی تریشی بەدەمەوە بگرن. پۆلیس و عەسکەر زۆر جار خزمی گیراوەکان ئەشکەنجە دەدەن، زۆربەی مەزەندەکان وای دادەنێن کە (١٠٠,٠٠٠) سەد هەزار یا (١٢٠,٠٠٠) سەد و بیست هەزار کەس ماوەی بەندکردنیان لەو مەرکەزانەی پۆلیس_دا بەسەر بردووە[١٧٢].

ڕێکخراوی Amnesty International لە لەندەن، لە ڕاپۆرتی ساڵانەی خۆیدا لە ١٩٩١دا باس لە وەزعی سەخت و تەواو پێشێلکردنی مافی کورد دەکات لە تورکیا. لەو ڕاپۆرتەدا گەلێ فاکتی تێدایە لەسەر وەزعی کورد، وەکو ناو و کات و جێگەی ڕووداوەکان. هەروەها سیاسەتی خراپی ڕژێمی تورکیا لەگەڵ ئاوارەکانی کوردی عێراق/ لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٨دا چوونەتە ئەوێ/، کە (٤٠) حاڵەتی تەسلیم کردنەوە بەعێراق تا (١٩٩٠) چارەنووسیان دیار نەبووە. لە ماوەی ئازار و حوزەیرانی ١٩٩٠یشدا بەزۆر (٢,٥٠٠) کەس ڕەوانەی عێراق کراونەتەوەو تورکیا ڕێگەی بە ئەفسەری عێراق داوە کە بچنە ئۆردوگای پەناهەندەکان بەو مەبەستەی بیان گەڕێننەوە بۆ عێراق[١٧٣].

بەیاننامەیەکی وەزارەتی عەدل لە تورکیا لە٢٠/٦/١٩٨٣دا دەڵێ، کە زیندانەکانی ئەوکاتە (٨٧,٨٦٦) کەسی تێدابووە، (٨١,٠٠٠) هەشتاو یەک هەزاریان کوردن، حوکمی ئیعدامی (٦,٢٥٣) کەسیان دراوە.

بەگوێرەی ڕۆژنامەی-میللیەت-ی تورکی/ ژمارەی ڕۆژی ١٩٨٥/٩/٢٨ لە کاتی هێرشەکانی (الشمس)دا، (٥،٨٢٣) کورد گیراون و (١٠٨) کەس کوژراون و (٤٢٦) کەسیش دیل کراون.

پەرلەمانی ئەورووپی لە ١٩٨٥/٥/٢٢دا بڕیارێکی دەرکرد لەدژی ڕژێمی تورکیا کە بەشێوەیەکی سیستێماتیک سیاسەتی قڕکردنی گەلی کورد پێڕەو دەکات. لە ١٩٨٥/١٠/٢٢یشدا بڕیارێکی تری دەرکرد، ڕەفزی دەست پێکردنەوەی پەیوەندی کردەوە لەگەڵ پەرلەمانی تورکیاداو وەفدی پەرلەمانی تورکیش لە پەرلەمانی ئەورووپی دەرکرد[١٧٤]. جارێکی تر پەرلەمانی ئەورووپی لە ١٩٩٢/٦/١٢دا بڕیارێکی دەربارەی مافەکانی گەلی کورد لە تورکیاو عێراق و ئێران و سوریا دەرکرد. ئەوە وەبیر دێنینەوە لەکاتێکدا کوردانی ئێران، سوریا و تورکیا مافی کەسایەتی و نەتەوایەتییان لێ قەدەغە دەکرێ، کورد لە عێراقدا هەڕەشەی لەناوچوون و قەلاچۆکردنی لەسەرە. ئەوسا پەرلەمان ئیدانەی هێرشی هێزە چەکدارەکانی تورکیا دەکات لە کوردستان و داوا لە حکوومەت و پەرلەمانی تورکیا دەکات. کە لەدەستوور و یاساو بڕیارەکانیدا هەموو ڕەنگ و ڕوویەکی ئاشکراو شاراوەی ڕەگەزپەرستی و دژایەتی کەس و گرووپ و دام و دەزگاکان بەهۆی زمان و ڕەچەڵەکی نەتەوایەتی، دەرهاوێژن. پاشان پەرلەمان داوای دابینکردنی مافەکانی گەلی کورد دەکات کە لەمەترسیدایە[١٧٥].

ئاشکرایە، سەرچاوەکانی ڕاگەیاندن لە ساڵی ١٩٩٤دا زۆر بەفراوانی لەسەر باکووری کوردستان شتیان بڵاو کردووەتەوە، کە بەهەزاران گوند وێران کراون و بەهەزارانیش زیندانی و ئاوارە کران. لە کانوونی یەکەمی ١٩٩٤ـەوە بەلای کەمەوە (٥٨٩٩) کەس زیندانی کراون و ئازاردراون لە ماوەی پانزە ڕۆژدا شەست و چوار مردوون و لەناو براون. لە ئەنجامی تیرۆری دەوڵەت کە لە ساڵی (١٩٨٠)وە لە باکووری کوردستان پەیڕەو دەکرێت. نیوەی دانیشتوانی کوردستان لەناو چوون. بەئاشکرا وا دیارە مەبەستی ڕژێمی تورکیا چۆڵکردنی کوردستان و تێکدانی زەمینەی کێشەی کورد و پەرت و

بڵاوكردنەوەی خەڵكی كوردستانە بۆ تواندنەوەیان لە چوارچێوەی پڕۆژەی (پێكهاتنەوەی ڕەگەزی وڵات) كە بەجینۆسایدی ئەرمەنییەكان دەستی پێكرد و دەركردنی (١,٢٠٠,٠٠٠) یەك ملیۆن و دووسەد هەزار یۆنانی لە ساڵانی ١٩٢٠دا لە ئەناتۆلیای بەدوادا هات و دەیانەوێ بە پەرت و بڵاوكردنەوەی كورد كۆتایی پێ بهێنن[١٧٦].

بەگوێرەی ئەو فاكتانەی كە خستمانە ڕوو، باكووری كوردستان تاوانی جینۆسایدی بەسەردا پراكتیك دەكرێ، بەگەل و خاكەوە، ئێمە دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە:

لە دەستووری توركیاو یاساكانی ناوخۆدا مافی گەلی كورد تەواو پێشێل كراوە. یاساكانی ناوخۆ ڕێگە دەدەن كە سیاسەتی، كوشتن، ڕاگواستن، توركاندن، وێرانكردن و شێواندنی مێژوو و كەلتوور جێبەجێ بكرێ و وەزعێكی نائاسایی و ئاڵۆز لە كوردستاندا پێك بێت، هەر وەكو پێكهاتووە، كە دەبێتە هۆی كەمبوونەوەی خەڵك و فەوتاندنی خەسڵەتی نەتەوەیی كورد. سەرباری ئەوانەش ڕژێمی توركیا بەشدارە لە كۆمەڵێ ڕێكەوتننامە و پەیماننامەدا لە دژی بزووتنەوەی كورد و لە پراكتیكیشدا لە دژی سەرجەم گەلی كورد.

## فاکتی تاوانی جینۆساید له ڕۆژهه‌ڵاتی کوردستان

له کوردستانی بن ده‌ستی ئێراندا، گه‌لی کورد مافی نه‌ته‌وه‌یی لێ قه‌ده‌غه کراوه و به‌ر شالاوی سیاسه‌تێکی کۆلۆنیالییانه که‌وتووه، جۆری ئه‌و تاوانانه‌ی ئه‌نجام ده‌درێن. لێره‌ش، وه‌کو له به‌شه‌کانی تری کوردستان، کوشتن، گرتن، ڕاگواستن، قه‌ده‌غه‌کردنی که‌لتووری نه‌ته‌وه‌یی، سه‌رکوتکردنی بزووتنه‌وه‌ی ڕزگاری نه‌ته‌وه‌یی گه‌لی کورد، پێڕه‌و ده‌کرێ.

دکتۆر عه‌بدولڕه‌حمان قاسملۆ ده‌ڵێ: (له سه‌رده‌می دیکتاتۆری بیست ساڵه‌ی ڕه‌زا شادا زۆرداریی نه‌ته‌وه‌یی گه‌یشته ئه‌وپه‌ڕی خۆی. شۆڤێنیزمی ئێرانی بوو به سیاسه‌تی ڕه‌سمی په‌هله‌وی و گه‌لانی غه‌یری فارسی ئێران خرانه ژێر توند و تیژترین سته‌می نه‌ته‌وه‌یی، بۆ له‌نێوبردنی شوێنه‌واری نه‌ته‌وه‌یی و مێژوو و فه‌رهه‌نگی ئه‌م گه‌لانه به‌رنامه‌یه‌کی داڕێژراو و درێژخایان به‌ڕێوه ده‌چوو که مه‌به‌ستی تواندنه‌وه‌ی گه‌لانی غه‌یری فارس بوو. ده‌ست تێوه‌ردانی مێژووی کۆن و نوێ، گۆڕینی ناوی شار و گونده‌کان، قه‌ده‌غه‌کردنی گه‌لێک ڕێوڕه‌سمی نه‌ته‌وه‌یی، ته‌نانه‌ت له‌به‌رکردنی جل و به‌رگی نه‌ته‌وه‌یی، هه‌موو بۆ ئه‌وه بوو که نیشان بدرێ له ئێراندا ته‌نیا تاقه نه‌ته‌وه‌یه‌ک هه‌یه، ئه‌ویش نه‌ته‌وه‌ی فارسه)[١٧٧].

ئه‌و سیاسه‌ته‌ی شای ئێران له دژی گه‌لی کورد، له‌چوارچێوه‌ی (تفریس)دا جێبه‌جێ ده‌کرا، زمانی فارسی سه‌پێندراو جگه له قه‌ده‌غه‌کردنی زمان و که‌لتووری کوردی، جل و به‌رگیش قه‌ده‌غه ده‌کرا[١٧٨]. به‌هه‌زاران که‌س له ناوچه‌کانی کوردستانه‌وه بۆ به‌شه‌کانی دیکه‌ی ئێران دوور ده‌خرانه‌وه، زۆریان ڕه‌وانه‌ی زیندانی قه‌سری قه‌جه‌ر کران[١٧٩]. زیندانه‌کانی تریش پڕکران. نزیکه‌ی (١٢٠) کورد له‌ماوه‌ی نێوان ١٩٣٤-١٩٤٠ ئیعدام کران. سیاسه‌تێکی

تایبەت بۆ دواخستنی کوردستان پێڕەو دەکرا، کە ئەنجامێکی خراپی هەبوو لەسەر ژیانی کەلتووری و تەندروستی و کۆمەڵایەتی گەلی کورد لە ئێراندا. هەتا جەنگی دووەم لە سەرجەمی ناوچەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا کە سەردەشت و سەقز و بانە و مەهاباد و شنۆ و لاجان و نەغەدە و بۆکان... هتد دەگرێتەوە کە دانیشتوانی نزیکەی یەک ملیۆن کەس دەبوو، تاقە قوتابخانەیەکی ئامادەیی هەبوو. لە ناوچەکانی مەهاباد و (٦٥) گوندی دەوروبەریدا، تەنیا پێنج قوتابخانەی سەرەتایی هەبوون، باری تەندروستیش لە باری ڕۆشنبیری خراپتر بوو، سەرجەمی ئەو ناوچەیە کە (٢٠٠,٠٠٠) دوو سەد هەزار دانیشتوانی هەبوو یەک نەخۆشخانەی تێدا بوو کە جێگەی بیست نەخۆشی تێدا دەبووەوە. هاوکات سیاسەتی ڕاگواستنیش پێڕەو دەکرا. لە ساڵی ١٩٣٥دا بەشێکی زۆری عەشیرەتەکانی گەڵباخ و جەلالی و پیران بۆ سوڵتان ئاباد و کرمان و شیراز ڕاگوێزران. لە زرووفێکی سەختی وادا ڕاگوێزران کە بە قسەی ئەفسەری سەرپەرشتکاری ڕاگواستنەکە هەموو ژن و منداڵ و گەلێ لە پیاوانیش لەرێگادا مردن[١٨٠].

لەنێوان دوو جەنگی جیهانیدا حکوومەتی ئێران، بەچەک خەڵکی کوردستانی سەرکوت دەکرد، زمانی کوردی بەتەواوی قەدەغە بوو، هەندێ تایەفەی کورد بەتەواوی قەڵاچۆ کران. عەشیرەتی جەلالی کە لە سنووری ئێران و تورکیا و سۆڤیەت دەژیان لە (١٠,٠٠٠) کەسیان کە بۆ ناوەندی ئێران ڕاگوێزرابوون ساڵی ١٩٤١ تەنیا چەند سەد کەسێکیان گەڕانەوە کوردستان. ژەنراڵ ئەحمەد ئاغا خان سەبارەت بەقەڵاچۆ کردنی خوێناوی لوڕەکان بە (قەسابی لوڕستان) ناوبانگی دەرکرد. تایەفەی گەڵباخیش بۆ ناوچەی هەمەدان و ئەسفەهان ڕاگوێزران تا تورک زمانەکان بۆ جێگەی ئەوان بێنن)[١٨١]. لەدوای ڕووخانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد ساڵی ١٩٤٦ و لەسێدارە دانی قازی محەمەد و کۆمەڵێ لە ڕابەرانی کۆمار، گەلی کورد کەوتەوە ژێر چەوساندنەوەو زمانی کوردی قەدەغە کرایەوە، چاپەمەنی کوردی یاساغ کراو کتێبە کوردییەکان سووتێنران[١٨٢].

سیاسەتی ڕژێمی پەهلەوی، دانی بەبوونی کورددا نەدەنا وەکو نەتەوەیەکی سەربەخۆ و جیاواز لە فارس. کاربەدەستانی ئێران وایان بڵاو دەکردەوە کە کورد یەکێکە لە قەبیلە ڕەسەنەکانی ئێران و زمانی کوردی یەکێکە لە زاراوەکانی زمانی فارسی. چەندین مامۆستای زانستگای تاران- و زانای ئێرانی لەلایەن کاربەدەستانەوە ڕاسپێردران، بۆ ئیسپات- کردنی ئەو بۆچوونە لێکۆڵینەوەو باسی مێژوویی و جوگرافی و زمانەوانی و سۆسیۆلۆگی بنووسن(١٨٣). دیارە ئەم سیاسەتە دەبێتە هۆی فەوتاندنی نەتەوەیی، زۆر بەهێمنی و بەکاوەخۆ پرۆسەی تواندنەوەی گەلی کورد ئەنجام دەدات. سەفیری بەریتانی لەگەڵ یەکەم سەفیری عێراقیدا لە دەرباری پەهلەوی، گفتوگۆ دەکات و دەڵێ:

(سیاسەتی تورک بەرامبەر کوردەکانی دانیشتووی ئەو وڵاتە، سیاسەتی توند و تیژی و نەهێشتنیانە بەهەموو ڕێگایەک، ئنجا بەتورک کردنیان. بەڵام سیاسەتی ئێرانی بەرامبەر کورد بریتیە لە سیاسەتی پشتگوێ خستن، واتە فەرامۆشکردنی ڕەگەزی کورد و یارمەتی نەدانی لەڕووی پەروەردەو تەندروستی و ئیسلاحات و شتی ترەوە تا ڕۆژێ دێ ئەوەندە لاواز ببێ نەتوانێ خۆی ڕابگرێ و ناچار بێ لەناو ڕەگەزی ئێرانیدا بتوێتەوە و نەمێنێ)(١٨٤).

ئەگەر سیاسەتی ڕژێمی پەهلەوی لە کۆندا بەو جۆرە بووبێ، بۆ فەوتاندنێکی لەسەرخۆی گەلی کورد، ئەوا سیاسەتی ڕژێمی تازەی ئێران، لەگەڵ درێژەپێدانی هەمان سیاسەتدا، بەکارهێنانی چەک و بەکۆمەڵ کوشتن و وێرانکردنی هەر جێگەو بەرەیەکە، کە داخوازی خەڵکی لێوە بێ بۆ مافە ڕەواکانیان. کوردستانی بندەستی ئێرانیش هەر وەکو بەشەکانی تری کوردستان کە لکێندراون بەو وڵاتانەو لەژێر زەبری سیاسەتێکی کۆلۆنیالیانەدایە، وەکو هەمان سیاسەتی تورکیاو سوریاو عێراق. ڕۆژهەڵاتناس پرۆفیسۆر م. س. لازەریف زانستیانە هەستی بەوە کردووە کە (سەرانسەری ناوچە کوردییەکانی ئەو وڵاتانە بەئاشکرا جیاوازی پێوە دیارە،

کە ئاستی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئابووری و کەلتووری نزمترە لە ناوچەکانی تری ئەو وڵاتانە)[١٨٥].

ڕەفتارێکی تری ڕژێمی ئێران، وەکو ڕژێمە داگیرکەرەکانی تری کوردستان، ئەوەیە، لە سەرژمێری دانیشتواندا، ڕاستی دەگۆڕێ و کەمی دەکاتەوە. هەر بۆ نموونە سەرژمێری ١٩٥٦ و ١٩٦٦ چۆنیەتی پێکهاتەی نەتەوەیی ئێران دەشێوێنێ، بەتایبەتی لە کورستانی ئێراندا[١٨٦].

ڕژێمی ئێران هەمیشە بەشداربووە لەگەڵ وڵاتانی تردا بۆ لێدانی هەر بزووتنەوەیەک لە کوردستاندا بێ. لەدوای هەرەسهێنانی کۆماری کوردستان لە مهاباد، سەرتیپ هۆمایۆنی لە ١٩٤٧/٣/٢٥دا، لە ناوچەی حاجی ئۆمەران چاوی بەژەنراڵی عێراقی عەلی حیجازی کەوت. حیجازی پێشنیاری بە هۆمایۆنی کرد کە ئەرتەشی عێراق ئامادەیە دژی بارزانییەکان یارمەتی لەشکری ئێران بدات. هێزە چەکدارەکانی تورکیەش ئامادەیی خۆیان بۆ هاوکاری لەگەڵ لەشکری شادا ڕاگەیاند[١٨٧].

یەکێک لەو ڕێکەوتننامە گرنگانەی نێوان ئێران و عێراق و تورکیا کە ئەفغانستانیش بەشداربوو بەسەرپەرشتی بەریتانیا، پەیمانی سەعد ئاباد بوو لە مانگی ئابی ١٩٣٧دا. بەگوێرەی ئەم پەیمانەش ئەو وڵاتانە هاوبەش بوون لە یەکخستنی هێزیان بۆ لێدان و ڕێگەندانی بزووتنەوەی ڕزگاری گەلی کورد لە ناوچە سنوورییەکانی هەر سێ وڵات[١٨٨]. یەکێک لە مەبەستە سەرەکییەکانی ئەو پەیمانە بریتی بوو لە بەشداربوون و هاوئاهەنگی توانای ئەو سێ وڵاتە لە دژی گەلی کورد. بەگوێرەی بەندی حەوتەمی ئەو پەیمانە بڕیاری بەکۆمەڵ ڕاگواستنی دانیشتوانی ناوچەکانی ڕۆژئاوای (کوردستانی بن دەستی ئێران) بوو بۆ ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران. هەمان بەند ئەوە دیاری دەکات کە لایەنەکانی ئەو پەیمانە پابەندێتی ئەوە دەخەنە ئەستۆی خۆیان، هەوڵ بدەن هیچ چالاکییەکی چەکدارانە یا کۆمەڵە و ڕێکخراو ڕێگە نەدەن کە بە مەبەستی هەڵوەشاندنەوەی ئەو دام و دەزگایانە بێت کە هەیە و بەرپرسیارێتی یا پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی هەموو بەشێکی سنووری ئەو وڵاتانەی

خستووەتە ئەستۆی خۆی[١٨٩].

بەگوێرەی ڕێکەوتننامەی نێوان ئێران و عێراق لە ١٩٣٧/٧/١٨دا هەردوولا لە دوای بڕیار لەسەردانی ئەو ڕێکەوتننامەیە بەزووترین کات چەند ڕێکەوتننامەیەکی تر مۆر دەکەن. دووان لەو ڕێکەوتننامانە پێوەندییان بە کوردەوە هەیە، دەربارەی ئاشتی و ئاسایشی ناوچە سنوورییەکان و دەربارەی گۆڕینەوەی تاوانباران[١٩٠]. لەدوای کەوتنی کۆماری کوردستان لە مهاباد و کۆماری ئازربایجانی ئێران، زیاتر لە (١٥,٠٠٠) کەس کوژران، ئەمە سەرباری ئیعدامکردنی ڕابەرانی کورد[١٩١].

ڕێکەوتننامەی ١٩٧٥/٣/٦، لە نێوان عێراق و ئێراندا، زەبرێکی کوشندە بوو لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد. بەگوێرەی پرۆتۆکۆلی ڕۆژی ١٩٧٥/٦/١٣ دەربارەی ئاسایشی سنووری نێوان ئێران و عێراق تەواوی سنووری نێوان ئەو دوو وڵاتە کۆنترۆڵ دەکرێ. ئەم پرۆتۆکۆڵە نۆ بەندە، شەش بەندی، لە بەندی یەکەمەوە تا بەندی شەشەمی پەیوەندی بە گەلی کوردەوە هەیە.

بەندی یەکەمی: هەردوو لا پابەند دەکات کە زانیاری دەربارەی "ئاژاوەچییەکان" بگۆڕنەوەو هەر کارێکی بەپێویستی دەزانن ئەنجامی بدەن بۆ بەربەند کردن و سەرکوتکردنی هەر چالاکییەک لەلایەن هەر دەستە و تاقمێکەوە بێ لەسەر خاکی هەر یەکێ لەو دوو وڵاتە دژی ئەوی تریان.

بەندی دووەم: داخستنی سنووری نێوان ئێران و عێراق بەهاوکاری هەمەجۆرەی هەردوو لا.

بەندی سێیەم: دیاریکردنی ئەو ناوچە سنوورییانەی نێوان ئێران-عێراق - تورکیا بۆ کۆنترۆڵکردنیان.

بەندی چوارەم: تەرخانکردنی هەموو جۆرە پێویستییەکی مرۆیی و ماددی گرنگ بۆ داخستنی سنوورەکان.

بەندی پێنجەم: ئاگادارکردنەوەی یەکتر و تەسلیم کردنەوەی "ئاژاوەچییان".

بەندی شەشەم: لە کاتی پێویست_دا بڕیار لەسەر قەدەغەکردنی هەر ناوچەیەک کە پێویستە دەیدەن، بۆ بەربەندکردنی کەسانی "ئاژاوەچی"[١٩٢].

لەپاش کەوتنی ڕژێمی شا و هاتنە سەر حوکمی حکوومەتی ئیسلامی لە ئێران، گەلی کورد کەوتەوە بەر ئاگر باران، کوردستان بوو بە مەیدانی ئیعدامکردن و گوللەبارانکردن، ئاگر خۆشکردنی شەڕی نێوان کورد و ئازەری و کوشتاری خەڵکی قاڕنە[١٩٣]. دیمەنی دیاری سیاسەتی ڕژێمی ئێرانن لەدژی گەلی کورد، بەبیانووی ئەوەی لە ئیسلامدا مەسەلەی نەتەوایەتی بوونی نییە، ڕژێمی ئیسلامی ئێران، کەوتە سەرکوتکردنی بزووتنەوەی نەتەوایەتی گەلی کورد و بە کۆمەڵ گرتنی خەڵکی کوردستان، بەکۆمەڵ کوشتن. ئیتر سیاسەتی جینۆساید کە ڕژێمی ئێران پەیڕەوی دەکات، لە پراکتیکدا نەخشی دیار بوو، گوللەبارانکردنی لاوانی کورد لە بەندیخانەکاندا، کوشتاری بەکۆمەڵی خەڵکی قاڕنە، قەلاتان، قەرەگۆل، کوورەخانەکانی سەروقامیش و کوشتاری بەکۆمەڵی گوندی ئیندرقاش، وسووکەند، دیلانچەرخ و سەروکانی. وێرانکردنی سەدان گوند و گواستنەوەی خەڵکی زەحمەتکێش و ڕەش و ڕووت بۆ ناوچەکانی تر و ئاوارەو دەربەدەرکردنی هەزاران خاو و خێزانی کوردستان[١٩٤]. وەنەبێ وێران کردن یا کوشتن و گرتن هەر تەنیا یەک ناوچەی گرتبێتەوە، سەرانسەری ناوچەکانی کوردستان - ئێران، ببوونە مەیدانی مەرگ و وێرانکردن. لە ١٩٩١دا، لەناوچەکانی باکووری کوردستانی ئێراندا، ئەم گوندانە وێران کران: سپیدارۆک، سولینک، فرخنیک و حروشە سوور. خەڵکی ئەو گوندانەش ئاوارە بوون و ڕوویان کردە گوندەکانی تر[١٩٥].

وەکو چۆن لە سەردەمی شای ئێراندا باری سەرنجی ڕەسمی دەوڵەتی دانی بە هیچ کێشەیەکدا نەدەنا کە ناوی کێشەی کورد بێ[١٩٦]. بەهەمان شێوەش کاربەدەستانی ڕژێمی کۆماری ئیسلامی ئێران لەدژی بزووتنەوەی ڕزگاری گەلی کوردن. نەک هەر نایانەوێ چارەسەری کێشەی کورد بکەن، بەڵکو کەوتنە زیاتر ئاڵۆزکردنی و وێرانکردنی کوردستان و بەکۆمەڵ کوشتنی

خەڵکەکەی. ئەگەرچی لەکاتی کەوتنی ڕژێمی شادا بزووتنەوەی کورد ناوچەکانی کوردستانی گرتە دەست و دەسەڵاتی خۆی تێدا دامەزراند، بەڵام ڕژێمی ئیسلامی هەر لەو کاتەوە لە سەرانسەری ناوچەکانی کوردستانی ئێران لە حاڵەتی جەنگدایە.

لە حوزەیرانی ١٩٨٣دا، حکوومەتی ئێران ڕایگەیاند کە هێزەکانی (١٠٠) سەد پێشمەرگەیان لە ناوچەی مهاباد کوشتووە. دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆ (سکرتێری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران) لە نامەیەکیدا بۆ کۆبوونەوەی یەکێتی جیهانیی مافی مرۆڤ، ڕایگەیاند کە حکوومەتی ئێران بۆمبای فسفۆڕی و گازی ژەهراوی لە هێرشەکانیدا بەکارهێناوە، هەروەها حیزبی دیموکرات، ئێرانی بەوە تاوانبار کردووە کە حکوومەتی تاران (٥٩) کوردی لە مهاباد و ورمێ لە دووی حوزەیراندا ئیعدام کردووە[١٩٧]. ئیتر ئەو ڕەشە کوژییە کە دەستی پێ کرا لە (١٢) ساڵی حوکمی ڕژێمی ئێراندا تا ساڵی ١٩٩١ زیاتر لە (٥٠,٠٠٠) پەنجا هەزار کورد کوژراوە[١٩٨].

ڕێکخراوی Amnesty International، لە ڕاپۆرتەکانی خۆیدا لە ساڵانی ١٩٨٧-١٩٩٠ بەژمارەو وێنە و فاکتەوە، ئێران بەپێشێل کردنی مافی مرۆڤ تاوانبار دەکات، کە بەکۆمەڵ خەڵکی دەگرێ یان بەکۆمەڵ ئیعدام دەکا و هەموو جۆرە ئازارێکی گیراوەکانیش دەدات. تەنیا لە ساڵی ١٩٨٩دا زیاتر لە (١,٥٠٠) کەس ئیعدام کراون، لەناو ئەوانەدا کورد و غەیری کوردیشی تێدایە[١٩٩]. ڕێکخراوی ئەمنیستی ئنتەرناشناڵ لە چەند ڕاپۆرتێکی تردا لە ١٩٩١، ١٩٩٢ و ١٩٩٣دا باس لە تاوانەکانی ڕژێمی ئێران دەکات، کە لەبەر جیاوازی بیر و ڕای سیاسی، ئاینی خەڵکی دەداتە بەر دادگای ناعادیلانەو بەر ئازار و ئەشکەنجە، ڕژێم دوای کەسانی هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆن دەکەوێ و تەنانەت لە دەرەوەی وڵاتیش دەیانکوژێ[٢٠٠]. هەر وەک لە نەیارانی ئێران لە وڵاتانی دونیا لە پاریس و یۆنان و ڤییەنا و ئەڵمانیا کوژران.

پەرلەمانی ئەوروپا لە ١٢ی حوزەیرانی ١٩٩٢ لە بڕیارێکیدا/خاڵی ٢٢/، داوا لە بازاڕی هاوبەش و دەوڵەتە ئەندامەکانی دەکات، کە هۆشیاربن لەوەی

که ئایا ڕێز له مافی مرۆڤی کوردی ئێران و سوریا چ به تاک و چ به کۆمەڵ دەگیرێ یان نا؟[201].

هەروەها له ١٦ی حوزەیران ١٩٩٣دا دیسانەوە بڕیارنامەی ١٢ی حوزەیران لەسەر مافه مرۆییەکانی گەلی کورد له هەر چوار بەشی کوردستان وەبیر دێنێتەوەو نارەزایی و ئیدانەی خۆی ئاشکرا دەکات و بەئاگاداربوونی تەواو لەو سەرکوتە توند و تیژە که ڕژێمی ئیسلامی ئێران له دژی کورد بەڕێوەی دەبات. دواییش نارەزایی لەو هێرشانه دەردەبڕێ که ئەرتەشی ئێران بەتۆپی قورس و بەپشتیوانی هێزی هەوایی کردوونیەته سەر گوندەکانی کوردستانی عێراق. پەرلەمانی ئەوروپا، هەروەها ڕووداوەکانی کوردستانی عێراق و تورکیا که لەدژی گەلی کورد پێڕەو دەکرێن وەبیر دێنێتەوەو داوا له شوورای کۆمەڵەی هاوبەشی ئابووری ئەوروپا دەکات که بەپەله مەسەلەی پێشێلکردنی بەردەوامی مافی مرۆڤ و لەژێر پێ نرانی بەردەوامی مافه دیموکراتیک و فەرهەنگییەکانی گەلی کورد بخەنه بەرباس و لێکۆڵینەوە. پێشێلکردنی ئەو مافانەش جێگیربوونی ئاشتی و سەقامگیربوونی له ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا کەم دەکاتەوە. هەروەها پەرلەمان، داوا له سەرۆکی پەرلەمان دەکا که ئەو بڕیارنامەیه به شوورای ئەوروپا، کومیسیۆنی پەرلەمانی ئەوروپاو هەروەها حکوومەتەکانی ئێران، عێراق، سوریا، تورکیا و کوردستانی عێراق ڕابگەیەنێ[202].

ڕژێمه یەک لەدوای یەکەکانی ئێران، بەشدارانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد بەتاوانبار دەزانن، هەر بۆیەش هەمیشه پیلانیان بۆ کوشتنیان ڕێکخستووە. کوشتنی سمکۆ، له سێدارەدانی قازی محەممەد و هەڤاڵانی ساڵی ١٩٤٦، کوشتنی د. قاسملۆ و هەڤاڵانی له ڤییەنا له ١٩٨٩/٧/١٣دا، کوشتنی د. سادقی شەرەفکەندی و هەڤالانی له بەرلین ١٩٩٢/٩/١٧، هەروەها کوشتنی هەزارانی تری بەشداری بزووتنەوەی کورد بەڵگەی ئەو ڕاستییەن. ڕژێمی ئێرانیش هاوکار و بەشداره لەگەڵ ڕژێمەکانی تری داگیرکەری کوردستاندا بۆ لێدانی کورد و ڕێگه پێ نەدانی ئازادی له هەر

جێگەیەکی کوردستان بێ. وەزیری دەرەوەی ئێران ویلایەتی لە پێویستی هاوکاری سێ قۆڵی ئێران و سوریاو تورکیادا داوای یەکخستن دەکات و دەڵێ:

(هەماهەنگی کردنی هەڵویستەکانی هەرسێ وڵات بەرەو پێشگرتن لە تەئسیراتی گێرەشێوێنانەی پشێوی ناوخۆ بەتایبەتی ئەوزاعی پشێوی ژووروی عێراق، لەسەر ئاسایشی نەتەوەی هەر سێ وڵاتەکە)[٢٠٣]. هەر بۆیە بەمەبەستی لێدانی هاوبەشی ئەو وڵاتانە لەدژی کورد و تێکدانی ئەو حکومەتەی کە لە خوارووی کوردستان دروست بووە، ڕۆژی ١٤/١١/١٩٩٢ لە ئەنقەرە کۆبوونەوەی سێ قۆڵی وەزیرانی دەرەوەی ئێران و تورکیاو سوریا پێک هێنرا. مەبەستی سەرەکی ئەو کۆبوونەوەیە پیلاندانان بوو لە دژی بزووتنەوەی کورد لەو وڵاتانەو تەگەرە خستنە بەر کاروباری حکومەتی کوردستانی عێراق[٢٠٤].

کۆبوونەوەی کۆمیسیۆنی بەربەند کردنی جیاوازی ڕەگەزو پشتیوانی لە کەمایەتییەکان سەربە ڕێکخراوی UN، لە نیوەی یەکەمی مانگی ١٩٩٤/٨دا ڕێکخرا، نوێنەری-فرانس لیبرتی- لەو کۆبوونەوەیەدا ڕاپۆرتێکی هەمەلایەنەی دایە بەشدارانی، بەشێکی ڕاپۆرتەکە پەیوەندی بەئێرانەوە هەبوو. ڕاپۆرتەکە دەڵێ؛ (حکومەتی ئێران وێڕای تیرۆریزمی دەوڵەتی، زۆر دەستدرێژی توندی دیکە لە بواری مافی مرۆڤ_دا لە ناوچە کوردنشینەکان ئەنجام دەدا). هەروەها ڕاپۆرتەکە گەلێ نموونە دێنێتەوە، هەندێک لەوانە:

١- لەنێوان ژوئەنی (حوزەیران) ١٩٩٣ تا ژانویەی (کانوونی دووەم) ١٩٩٤دا، (٥٦) کەس بە تاوانی لایەنگری لە حیزبی دیموکراتی کورستانی ئێران گیراون و ئەشکەنجەدران.

٢- (٥) کەس لە ئەندامانی ئەو حیزبە، پاش دوو ساڵ زیندانی کردن، لە مارسی ١٩٩٤دا لە شاری کرماشان ئیعدام کران،

٣- لە ٨ی سێپتێمبەری ١٩٩٣دا، (٧٠) کەس بەتاوانی لەبەرکردنی جل و

بەرگی کوردان گیراون، کە (١٠) دە کەسیان بێ سەر و شوێن کراون.

٤- لە مانگی ژوویئە (تەمموز) تا دیسامبری ١٩٩٣دا، نزیکەی (١٠٠) دێ کە زۆربەیان لە ناوچەکانی سەردەشت، بانە، شنۆ، بۆکان و مهابادن وێران کراون و دانیشتوانیان دەرکراون، ژمارەیەکی زۆریش لەو گوندنشینانە بەهۆی ئەو مینانەوە کە دانراونەوە گیانی خۆیان لەدەست داوە. ئەو مینانە لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٣دا لەو گوندانە کە لەگەڵ کوردستانی عێراق هاوسنوورن دانراونەوە.

٥- (١٥٠,٠٠٠) سەد و پەنجا هەزار کەس لە هێزە چەکدارەکانی ڕژێم لە ناوچەی کوردستان جێگیر کراون و دەبنە هۆی خوڵقاندنی کارەساتی دڵتەزێن.

٦- لە ساڵی ١٩٩٣دا، (١٣٠) کردەوەی تیرۆریستی لە کوردستانی عێراق بەڕێوە چوون. نزیکەی (٢٠٠) گوند کە زۆربەیان بەیارمەتی ڕێکخراوە ئینسانییەکان ئاوەدان کراونەتەوە، لە ئاکامی بۆمباباران و تۆپبارانی هێزەکانی ئێران_دا وێران کراون.

٧- خەڵکی ئاسایی کە پێشتر گیروگرفتی زۆریان هەبوو، لە ئاکامی ئەو هێرش و دەستدرێژییە نیزامییانەدا، تووشیماڵوێرانییەکی زۆر هاتوون(٢٠٥).

ئەم ڕاپۆرتەی-فرانس لیبرتی- چمکێک لە تاوانەکانی ڕژێم لە ئێرانداو بەڵکو لە دەرەوەی ئێرانیشدا لە دژی کورد پیشان دەدات. ئەوەی گرنگە ڕوون دەبێتەوە کە ئێران بەئازادی لەدەرەوەی ئێرانیشدا سەغڵەت دەبێ و نایەوێ گەلی کورد بەئارامی لەسەر خاکی خۆی بژی و هەوڵی پێکهێنانی پاشەڕۆژێکی سەربەخۆ بدات، چونکە لەهەر جێگەیەک ئازادی بۆ کورد هەبێ، ئەو ڕژێمانە بە مەترسی دەزانن لەسەر خۆیان بۆیە خاڵی گرنگی تاوانەکانی ئەو ڕژێمانە لێرەدا وا ڕوون دەبێتەوە کە کورد مافی نەتەوەیی نییەو سەربەخۆیی و ئازادی بۆ کوردان بەمەترسی دەزانن.

لێرەشدا، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە سیاسەتی ڕژێمەکانی ئێران، بریتییە لە نەهێشتنی کیانی نەتەوەیی کورد کە بەگەلێ ڕێگای جیاو هاوبەش پێڕەو دەکرێ، ڕژێمی ئێران هەر خۆی سیاسەتی بەکۆمەڵ کوشتن و وێرانکردن و ڕاگواستنی لەکۆنەوە پێڕەو کردووە، لەلایەکی تریشەوە هێشتنەوەی کوردستان لە ئاستێکی نزم و دواکەوتوودا، ئەمە سەرباری ئەوەی کە ڕژێمی ئێران بەشدارە لە ڕێکەوتننامە و کۆبوونەوەی چەند لایەنەدا لە دژی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد و لەپراکتیکیشدا ئەرتەشی خستووەتە کار و بەکوردستاندا بڵاوی کردووەتەوە و سیاسەتێکی ڕەق و نیرهابییانە ڕەفتار دەکات. ڕێگە پێ نەدانی ئازادی و کوشتن و وێرانکردن و بەکارهێنانی چەکی جۆربەجۆر، چەوساندنەوەیەکی بەردەوامی گەلی کوردە، هەر بەردەوامیشەو لە مردنێکی لەسەرخۆدایە کە پێڕەو کردنی سیاسەتی جینۆسایدە لەپرۆسەدا دەبێ. خەڵکی کوردستان چ بەتاک چ بەکۆمەڵ نارەزایی دەربڕن و داوای ئازادی و مافە نەتەوەییەکانیان بکەن، ئیتر ژیان لە مەترسیدایە و ماڵ و جێگەیان وێران دەکرێ. کەواتە ڕەفز کردنەوەی مافی نەتەوەیی بۆ کورد مەرجە بۆ ئەوەی ڕژێم دەست لە سیاسەتی جینۆساید هەڵگرێ! کێشەی کوردیش لە سەردەمی ڕژێمەکانی ئێراندا هەر لەو چوارچێوەیەدا بووە، نە دان بە سەربەخۆیی خەڵکی کوردستاندا دەنرێ و نە کوردستانیش بەنیشتمانی گەلی کورد دەناسرێ.

# فاكتی تاوانی جینۆساید له ڕۆژئاوای كوردستان

گەلی كورد له ڕۆژئاوای كوردستان له چەوساندنەوەیەكی نەتەوەیی بەردەوام دایه. جۆری سیاسەتی ڕژێمی سوریا جیاوازه لەگەڵ سیاسەتی وڵاته داگیركەرەكانی تری كوردستان. له ڕۆژئاوای كوردستان نه بزووتنەوەیەكی چەكدار هەیەو نه شەڕیش هەیه، بۆیه جێبەجێ كردنی سیاسەتی جینۆساید لەم بەشەی كوردستاندا، میتۆد و نەخشەی جیاوازی گرتووەته خۆ. مەرج نییه جینۆساید هەر لەكاتی شەڕدا یا بەهۆی شەڕەوه ئەنجام بدرێ، هەر وەكو پەیماننامەی ١٩٤٨ دەربارەی قەدەغەكردنی جینۆساید و سزا خستنه سەر تاوانكارانی جەختی لەسەركردووە. جینۆساید نەك هەر له سەردەمی شەڕدا، بەڵكو له سەردەمی ئاشتیشدا ئەنجام دەدرێ، چونكه مەبەست له جینۆساید هەر فەوتاندنی فیزیكی (بەدەنی) مرۆڤ نییه به تەنیا، بەڵكو فەوتاندنی كەلتووری-نەتەوەیی مەترسییەكەی لەوەدایه، ئەو كۆمەڵه مرۆڤەی كه پەیوەندیی نەتەوەیی یەكیان دەخات، بوونی نامێنێ و به درێژایی مێژووی ئاسەواری كوێر دەبێتەوه. ئەمەش دەبێته زەبر بۆ مێژوو مرۆڤایەتی، چونكه كەلتوور و ئابووری و سیاسەت و مێژووی شارستانیەتی نەتەوەیەك هەڵدەتەكێندرێ و لووش دەدرێ.

هەر له دامەزراندنی دەوڵەتی سوریا و لكاندنی هەندێ ناوچەی خۆرئاوای كوردستان پێوەی، حكوومەتی سوریا كەوته پەیمانكاری لەگەڵ توركیاو عێراق و ئێراندا. یەكێ له مەبەسته گرنگەكانی ئەو پەیمانكاریه، هاوجووت كردنی هەوڵ و تەقەللای سوریا لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا بۆ بەربەرەكانێ و بەربەند كردنی هەر بزووتنەوەیەكی كوردییه، چونكه پاشەڕۆژی ئەو بزووتنەوەیه به مەترسی دادەنێن بۆ لەتكردنی ئەو سنووره دەسكردەی كه لەنێوان ئەو وڵاتانەدایه.

له ٣٠/٥/١٩٢٦دا پەیماننامەی دۆستایەتی لە نێوان تورکیا و فەرەنسادا مۆرکرا، پاشتر پرۆتۆکۆڵی ژمارە هەشت وەکو پاشکۆی ئەو پەیماننامەیە مۆرکرا، لەبەرئەوەی ئەوکاتە سوریا لەژێر مانداتی فەرەنسادا بوو، بەگوێرەی بەندی یەکەمی ئەو پرۆتۆکۆڵە، سوریاو تورکیا پابەندن بە بەرهەڵستی کردنێکی هاوبەش لەدژی هەرکەس و دەستەیەک بێت لە ناوچە سنوورییەکانی نێوان هەردوو لایان. بەگوێرەی بەندی سێیەم و چوارەمیش، هەردوولا "تاوانباران" کە ئاودیو دەبن، دەگرن و تەسلیمی یەکدی دەکەنەوە[٢٠٦]. ئەوە ئاشکرایە کە تاوانباران و چەکداران مەبەست لەو هێزو گروپە کوردییانەیە کە ئەو سەردەمە لەخەباتدا بوون بۆ وەدیهێنانی مافەکانی گەلی کورد.

ساڵی ١٩٤٦ لەدوای کۆتایی هاتنی مانداتی فەرەنسا لە سوریا، کە سەربەخۆیی ڕاگەیاندرا، ئیتر حکومەتی سوریا کەوتە جێبەجێ کردنی سیاسەتی (پشتێنی عەرەبی)و تەعریبکردنی ناوچە کوردییەکان لەسەر سنووری تورکیا و عێراق[٢٠٧]. ئەم سیاسەتە دوو پرۆسەی پێ ئەنجام دەدرا، یەکەم تەعریبکردنی ناوچە سنوورییەکان و ڕاگواستنی کورد، دووەمیش، دوورخستنەوەی کوردی دیوی سوریا لە کوردی ناوچە کوردییەکانی دیوی تورکیا و عێراق.

پشتێنی عەرەبی، ناوچەیەکی پا نو بەرینی گرتەوە بەدرێژایی (٣٢٠) کیلۆمەتر و بەپانایی (٣٠) کیلۆمەتر. پرۆژەیەکی تری سیاسەتی سوریا بەپلانی (سەرژمێری نائاسایی) کوردەکان ناسراوەو تەنیا بۆ ناوچەکانی کوردستان بوو، کە (١٥٠,٠٠٠) سەد و پەنجا هەزار کورد بە بێگانە لەقەڵەم دران و بێ بەڵگەنامە و ناسنامەی سوری مانەوە. هەروەها دەوڵەتی سوری لە ساڵەکانی حەفتاکاندا لەژێر ناوی (گوندی مۆدێرن)دا پرۆژەیەکی تری داڕشت. مەبەستی ئەم پرۆژەیەش بریتی بوو لە ڕاگواستنی چەند خێڵێکی کورد بۆ دەرەوەی ناوچەکانی کوردستان و نیشتەجێکردنی خێڵە عەرەبەکان لە جێگاکانیان[٢٠٨].

بەگوێرەی پیلانی (پشتێنی عەرەبی) ڕژێمی سوریا دەیویست لە ماوەی

پێنج ساڵدا دانیشتوانی کوردستان ڕیشەکێش بکات و ناچاری کۆچکردنیان بکات. بۆ ئەو مەبەستەش لە بەرایی سنووردا بەقووڵی (١٥) کیلۆمەتر و بە درێژایی (٣٧٥)کم، سەرجەم ٣٣٢ گوندی بەنێوی (کێڵگەی دەوڵەتی)یەوە چۆڵ کرد[٢٠٩]. ئەو کارانەش وا ئەنجام دەدرێ، هەر داخوازییەک لەلایەن کوردەکانەوە بکرێ بۆ بەدیهێنانی مافی نەتەوەیی، ئەوا بەکوشتن و بڕین وەڵام دەدرێتەوە. بۆ بەربەند کردنی هەموو هەوڵێکیش، ڕێکخراو و کەسانی ناوداری کورد چەوساندنەوەیەکی توند کەوتووەتە سەریان[٢١٠].

حکوومەتی سوریا لە پرۆگرامی خوێندندا ئەوەی جێگیر کردووە کە کوردەکان لە شوێنی ترەوە هاتوون و لەو ناوچانەدا جێگیر بوونە[٢١١]. ئەمەش ڕەفزکردنی ڕاستییەکی مێژووییە کە ئەو خاکەی کورد لەسەری دەژی کوردستانە. لە زانستی مێژوودا ئەوە ڕوون کراوەتەوە کە بوونی کورد لەو ناوچانەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست_دا لە پێش بوونی تورک و عەرەبیشەوەیە.

پرۆژە نهێنییەکەی (محمد طلب هلال) لێپرسراوی سیاسی ناوچەکانی جزیرە ساڵی ١٩٦٣ بە ناونیشانی-لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی ناوچەی جزیرە لە ڕوانگەی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە- لە (١٥٩) لاپەڕەدا، تابلۆیەکی دیاری سیاسەتی سوریایە و نەخشەی لەناوبردنی گەلی کوردی لە چوارچێوەدا داڕێژراوە. ناوەڕۆکی ئەو پرۆژەیە زۆر بەڕاشکاوی سیاسەتی جینۆسایدی تێدا دیاری کراوە لەدژی بوونی نەتەوەیی کورد. محمد طلب هلال دەڵێ: (هیچ گەلێک نییە ناوی-کورد- بێت، میللەتێکیش نییە ناوی میللەتی کورد بێ).. هەروەها دەڵێ: (هەرگیز زمانێک نادۆزینەوە ناوی زمانی کوردی بێ).. ناوبراو زۆر بێ ئابڕووانە پێی لێ دادەگرێ و دەڵێ؛ (کوردەکان نیشتمانێکی نەتەوەییان نییە، بەڵکو کەسانێکی دانیشتووی چیاکانن..). ئیتر بەقسەی ئاغای هیلال گەلی کورد (مێژووی نییەو شارستانیەتی نییە و زمانی نییە و بەڵکو ڕەگەزیشی نییە)[٢١٢]. دیارە ئەو بیر و ڕایەی محمد طلب هلال، وەکو کاربەدەستێکی گەورەی سوریا پێشتر ڕەفتاری پێ کراوە، بۆیە وا بەڕاشکاوی و بێ ئابڕووانە کردوویەتی بە پرۆژەیەکی سیاسی و بەنووسراوی

بەرزی کردووەتەوە بۆ سەرانی دەوڵەتی سوریاو نیتر پاشتر لە سیاسەتی ڕەسمی دەوڵەتدا تەواو ڕەنگی دایەوە.

سالآنی ١٩٤٥-١٩٥٨ ڕژێمی سوریا زۆربەی ئەفسەرە کوردەکانی لە سوپا دەرکرد، ساڵی ١٩٥٨ ڕێگای زانکۆ لە قوتابیانی کورد بۆ کۆلیجەکانی ئەفسەری و پۆلیسی گیرا. کاسێت و چاپەمەنی کوردی قەدەغە کرا و کەوتنە شکاندن و سووتاندنیان. هەر کەسێک پێی بگیرایە، ئەوا دەخرایە زیندان. دەست کرا بەتەعریبکردن و (١٥,٠٠٠) پانزە هەزار خێزانی عەرەب لە ناوچەکانی حەس و سەلەمیە هێنرانە کوردستان و لە زەوییە بەپیتەکانی زەهیریە و ئەحمەدیە نیشتەجێ کران. لە هاوینی ١٩٦٠دا ژمارەیەکی زۆری سەرانی پارتی دیموکراتی کوردستانی سوریا و نزیکەی (٥,٠٠٠) پێنج هەزار کوردی تر زیندانی کران. ساڵی ١٩٦٢ دەوڵەتی سوریا سەرژمێری ناوچەکانی کوردستانی کرد، بەپێی ئەو سەرژمێرە ٩٠٪ی دانیشتوانی کوردستان لە مافی هاونیشتمانێتی بێ بەش کران و بەڵگەو ناسنامەیان لێ زەوت کرا[٢١٣].

لە مانگی ئەیلولی ١٩٦٢دا ڕژێمی سوریا، سەرژمێری نائاسایی پارێزگای جەزیرەی کرد، بەگوێرەی ئەم سەرژمێرە زیاتر لە (٢٠٠,٠٠٠) دوو سەد هەزار کورد مافی هاونیشتمانێتییان لێ سەندرایەوەو بێ وڵات و بێ ناسنامە مانەوە. تەنانەت گەلێ خێزان هەندێ لە ئەندامانیان بەبێ ناسنامە و هەندێکیش ناسنامەیان هەرماوە. وەکو دایک و باوک ناسنامەیان هەیەو منداڵەکانیان لێیان سەندراوەتەوە یان بە پێچەوانەوە[٢١٤]. دیارە ئەم سیاسەتەش دەبێتە هۆی ئەوەی، ئەوانەی بێ هیچ ناسنامەیەک ماونەتەوە مافی ژیانیان لێ زەوت کراوە، چونکە نە مافی ئیشکردن، نە کڕین، نە فرۆشتن، نە ژن هێنان یا شووکردن... هتد هیچ یەکێک لەو مافانەیان نییە، کەواتە ڕێگەی بەردەوامبوونی ژیانیان لێ گیراوە. لەلایەکی ترەوە، (٦٠,٠٠٠) شەست هەزار کەس لە دیمەشق بەگوێرەی هەمان یاسای (سەرژمێری نائاسایی) بەبێ ناسنامە ماونەتەوە[٢١٥].

سیاسەتی تەعریبکردن لە کوردستاندا، لەلایەکەوە عەرەبی لەو ناوچانە نیشتەجێ دەکرد و لەلایەکی ترەوە پەیوەندی کوردی دیوی سوریاو دیوی تورکیا و عێراق لەیەک داپچڕێ و ئەو کوردانەی ناو سنووری سوریا لە ناوچە سنوورییەکانەوە، ڕاگوێزران، کە لەئاکامدا بەگوێرەی سیاسەتی (پشتێنی عەرەبی)، (١٤٠,٠٠٠) سەد و چل هەزار جوتیار و ڕەنجدەری کورد جێگەکانیان بەعەرەب پڕ کرایەوە و زیاتر لە (٦٠,٠٠٠) شەست هەزاری تریش ڕوویان کردە تورکیاو لوبنان و شوێنەکانی تری سوریا[٢١٦].

ڕژێمی سوریاش لەگەڵ ڕژێمە داگیرکەرەکانی تری کوردستاندا بەشدارە لە دژایەتیکردنی بزووتنەوەی کورددا. لە ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٣ یەکێتییەکی سوپایی لە نێوان سوریاو عێراق پێکهات. ئەنجومەنێکی باڵا بۆ بەرگری هاوبەشی هەردوولا لە ١٩٦٣/٩/٢دا ڕاگەیاندرا. سوپای سوریا سنووری بڕی و هاوشانی سوپای عێراق لە ناوچەکانی زاخۆ و دهۆک بە تانک و فڕۆکە و تۆپی قورسەوە، بە قسەی عبدالسلام عارف (ئەرکی پیرۆز)ی بەجێ گەیاند. ڕژێمی عێراق بە ڕەسمی ڕایگەیاند کە هێزە چەکدارەکانی سوریا لە (باکووری عێراق!) وا دەجەنگن، سەرۆکی ئەوسای عێراق عبدالسلام عارف لە سەردانی هێزەکانی سوریادا وتی؛ (براکانم! بەناوی میللەتی عەرەبەوە بەخێرهاتنتان دەکەم، سوپاس بۆ یەزدان بۆ ئەم یەکەم بەیەکگەیشتنە. ئێمە بەختیار و خۆشحاڵین کە دەبینین سەربازانی عێراق و سوریا هاوشان دەجەنگن)[٢١٧]. بەگوێرەی بیر و ڕای محمد طلب هلال، دەبوایە هێزی سوریا بەپەلە بەشدار بووایە لە شەڕی دژی کورد لە (باکووری عێراق!)، تا نەخشەی ڕاگواستن و تەعریب کردنی کوردستانی سوریا هاوکات بێت لەگەڵ لێدانی بزووتنەوەی کورد لە عێراق، چونکە ئەو شەڕە شەڕی (چەک و باوەڕ)ە[٢١٨].

چاوگێڕانێک بەناوەڕۆکی پرۆژەکەی محمد طلب هلالدا، چاکتر لە سیاسەتی سوریامان ئاگادار دەکات، چونکە ئەو پرۆژەیە بووە بە بەرنامەی سیاسی حکوومەت و جێبەجێ دەکرێ. هیلال لە پێشەکیدا مەبەستی پرۆژەکەی دەربارەی ناوچەی جەزیرە وا ڕوون دەکاتەوە:

(اصبحت اليوم مهددة تدق ناقوس الخطر مستصرخة الضمير العربي الحي لانقاذها وتطهيرها من كل الشوائب والزبد التاريخي لتعود مساهمة فعالة كأخواتها من محافظات هذا القطر-العربي- نظرا لموقعها ومركزها وانتاجها وثروتها)

دەقەکەی بەکوردی:

پارێزگای جەزیرە (ئیمرۆ بەر هەڕەشە کەوتووەو زەنگی مەترسی لێ دەداو داوا لە ویژدانی زیندووی عەرەبی دەکات تا رزگاری بکا و لە هەموو پیسی و پۆخڵەواتێکی مێژوویی پاکی بکاتەوە، تا چالاکانە لەبەر جێگەو شوێن و بەرهەم و سامانی وەکو پارێزگاکانی دیکەی ئەم وڵاتە عەرەبییە بەشدار بێتەوە)[٢١٩].

سەیرە! محمد طلب هلال، خاوەن دەوڵەت و ئابووری و دەسەڵات بە دەست بەجۆرێک بوونی کورد خستوویەتییە مەترسییەوە تا هاوار بۆ (ویژدانی زیندووی عەرەب) ببات و پارێزگای جزیرە لە کورد ڕزگار بکەن! کوردی نیشتمان دابەشکراو و ئازادی لێ زەوت کراو، ئابووری وڵاتەکەی دەکرێتە چەک بۆ پڕۆژەی لەناوبردنی خۆی، هێشتا بەلای ئاغای هیلالەوە ترسناکە لەسەر (میللەتی عەرەب!). لەڕاستیدا ئەم بیر و ڕایە، لەرادەبەدەر فاشییانەو دژ بە کەمترین و سەرەتاترین مافی ئاسایی مرۆڤە.

پڕۆژەکەی محمد طلب هلال بریتییە لە پێشەکی و دەسپێک و شەش فەسڵ. لە فەسڵی یەکەمدا، نووسەر کەوتووەتە شێواندنی مێژووی کورد و نکوڵی لە بوونی دەکات، چ وەک-گەل- یا وەکو-نەتەوە- کە خاوەنی مێژوو و زمان و شارستانیەت نییە و دەڵێ: (فهم أناس يعيشون على ما تقدمه الامم من تراث وحضارات ليس لهم فيها أى سهم ولم يقدمو أو يؤثرو على تلك الامم والحضارات ولا بشعيرة صغيرة من انتاجهم ايا كانت)[٢٢٠]. واتە: (ئەوانە خەڵکێکن لەسەر کەلەپوور و شارستانیەتی میللەتانی تر دەژین، هیچ بەشدارییەکیشیان تێیدا نییە و ئەوەندەی تاڵە موویەکیش هیچیان پێشکەش نەکردووەو بەهیچ جۆرە بەرهەمێکیش کاریان لەو میللەت و شارستانیەتانە نەکردووە).

تەنیا ئەم بیر و رایە خۆی لەخۆیدا پرۆسەکردنی تاوانە دەرهەق بەگەلی کورد، لێرەدا، ئێمە نامانەوێ بچینە سەر ئەو باسەی کە کورد میللەتێکی دێرینەو خاوەن کەلتوور و مێژوویەکی تایبەت و سەربەخۆیە، با لە مەبەستی سەرەکی باسەکەمان دەرنەچین تەنیا دەپرسین، ئەگەر کورد وایە کە کاربەدەستی گەورەو سیاسەت مەدارێکی دەوڵەتی سوریا، وەکو محمد طلب هلال دەڵێ، ئەی بۆچی ئەوەندە لە بوونی کورد دەترسێ و سیاسەتی خۆی و دەوڵەتەکەی لەسەر پرۆژەکەی ئەو داڕێژراوە؟! ئیتر ئەو بیر و رایە نەخشەی فەوتاندنی نەتەوەیی کورد دیاری دەکات، هەر وەکو لە فەسڵی یەکەمدا گەیشتووەتە ئەم ئەنجامە و کێشەی کورد بەمەترسی لەسەر بوونی عەرەب دەزانێ، بۆیە پێی وایە ئەو کێشەیە: (قد اصبحت تهدد الكيان العربي، مغذاة من الجهات المعادية للقومية العربية قديمها وحديثها في الخارج والداخل)[٢٢١]. واتە کێشەی کورد (ئیتر هەڕەشە لە بوونی عەرەب دەکات، چونکە لە دەرەوەو لە ناوەوە لەو لایەنانەوە پشتگیری دەکرێ کە دوژمنی کۆن و تازەی نەتەوەی عەرەبن). کەواتە، دانەر و سیاسەتمەداری دەوڵەتی سوریا بڕیار دەداو دەڵێ؛ (لذا وجب حلها جذريا و وضع الخطط اللازمة لذلك في القطرين الشقيقين سورية والعراق ويكون الحل موحدا والخطة واحدة)[٢٢٢]. واتە: (بۆیە پێویستە لە ڕەگ و ڕیشەوە چارەسەری بکرێ و نەخشەی پێویستی بۆ دابنرێ تا لەهەردوو وڵاتی برا، سوریاو عێراق یەک چارەسەر و یەک نەخشەی هاوبەش بێ). ئەوەمان لەبیر بێ، وەکو پێشتر باسمان کرد کە سوریاو عێراق بەسویای هاوبەش کەوتنە لێدانی بزووتنەوەی کورد، لەلایەک، لەلایەکی ترەوە، تەواوی ئەو خاڵانەی لەو پرۆژەیەدا دراون بەڕژێمی سوریا لە پراکتیکدا تا کاتی نووسینی ئەم باسە کاریان پێ دەکرێ، بۆیە سیاسەتی ڕژێم لەدژی کورد تەواو نەهێشتنی کەلتوور و بوونی نەتەوەییە لە چوارچێوەی سوریادا، بگرە بەشداربوونیش لەگەڵ وڵاتانی تری داگیرکەری کوردستاندا.

لە فەسڵی دووەمدا نووسەر دەچێتە سەر باسی بوونی کورد لە پارێزگای جزیرەو دەڵێ؛ (يتكاثف هذا في الامكنة الخصبة بحيث يستعصي عليك ايجاد

جيب عربي صغير في بعض المناطق وخصوصا في منطقة المالكية وقبور البيض والقمشلي وعامودا ويحتلون اخصب المناطق في الجزيرة واكثرها امطارا)[٢٢٣].
هەرچەند ئاغای دەسەڵاتدار نکۆڵی لە بوونی نەتەوەیی کورد دەکات و بوونی خاکی کوردستان لەلای ئەو نییە، بەڵام ئەم بیر و ڕایەی ئیسپاتی ئەوەیە کە خۆی بە درۆ دەخاتەوەو ڕوونی دەکاتەوە کە زۆربەی دانیشتوانی کوردستان کوردن و کوردستانیش وڵاتێکی دەوڵەمەندە.

سەرنج بدەن دەڵێ؛ (يحتلون اخصب المناطق) واتە بەپیت_ ترین ناوچەیان داگیر کردووە، وشەی (داگیر کردووە) بەکار دەهێنێ، پێی وایە وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، کورد هاتوون و خاکی عەرەبیان داگیر کردووە. پاشتر نووسەری پڕۆژەکە دەچێتە سەر باسی نەوەی نوێی کورد و دەڵێ؛ (ان هذا الجيل الذي اصبح متعلما هو عنصر الخطر)[٢٢٤]. بەلای ئەوەوە نەوەی نوێی کورد کە خوێندەوارە، جێگەی مەترسییە. بۆیە وای بۆ دەچێ: (كان يقال قديما عربوهم بالعلم وكانت النتيجة ان العلم الذي قدمناه لهم اصبح السلاح الاول والعقائدي بين ايديهم)[٢٢٥]. واتە: (لەکۆندا دەیان وت بەزانیاری تەعریبیان بکەن. بەڵام ئەنجامەکەی وا کەوتەوە ئەو زانیارییەی کە پێشکەشمان کردن، بوو بە یەکەم چەکی باوەڕ بە دەستیانەوە). کەواتە پێی وایە بەزانست خەڵکی کوردستان زیاتر بوونە بەدوژمن بۆیە دەڵێ؛ (خلقنا لانفسنا بانفسنا أعداء الداء أشداء جمعوا بين الشراسة والعقيدة والحجة بل والبيان)[٢٢٦]. هەر بۆیەش داوا دەکات و دەڵێ؛ (نقترح سياسة التجهيل لاننا لسنا بحاجة لخلق دائم_ وتجديد مستمر بعد الان وبواسطة مدارس الدولة ومعاهدها حيث اثبتت التجربة عكس ماكان يقال – علموهم يستعربون)[٢٢٧]. واتە: (پێشنیاری سیاسەتی تجهيل دەکەین. چونکە ئێمە لەمەودوا ئیتر پێویستمان بەداهێنانی هەمیشەیی و نوێ کردنەوەی بەردەوام نییە بەهۆی قوتابخانەو ئامۆژگاکانی دەوڵەتەوە، تاقیکردنەوە پێچەوانەی ئەوەی ساغ کردەوە کە وتراوە-فێریان بکەن تەعریب دەبن).

ناوەڕۆکی تەواوی پڕۆژەکەی محمد طلب هلال، کە مەبەستی سەرەکییە لە

دارشتنی نەخشەو پیلانی فەوتاندنی کورد و تەعریب کردنی خەڵکەکە و خاکەکەیان، لە (١٢) خاڵدا بەم جۆرە خراوەتە ڕوو، وا دەقاودەق وەکو خۆی دەیان نووسینەوە:

١- ان تعمد الدولة الى عمليات التهجير الى الداخل مع التوزيع في الداخل ومع ملاحظة عناصر الخطر اولا فأول. ولابأس ان تكون الخطة ثنائية او ثلاثية. السنين تبدأ بالعناصر الخطرة لتنهي الى العناصر الاقل خطورة وهكذا...

٢- سياسة التجهيل: أي عدم انشاء مدارس او معاهد علمية في المنطقة لان هذا اثبت عكس المطلوب بشكل صارخ وقوي..

٣- ان الاكثرية الساحقة من الاكراد المقيمين في الجزيرة يتمتعون بالجنسية التركية. فلابد لتصحيح السجلات المدنية وهذا يجري الآن انما نطلب ان يترتب على ذلك أجلا وكل من لم تثبت جنسيته وتسليمه الى الدولة التابع لها. اضف الى ذلك يجب ان يدرس من تثبيت جنسيته دراسة ايضا معقولة وملاحظة كيفية كسب الجنسية لان الجنسية لاتكسب الا بمرسوم جمهوري. فكل جنسية ليست بمرسوم يجب ان تناقش تبقى من تبقى أي الاقل خطرا وتنزع من تنزع عنة الجنسية لتعيده بالتالي الى وطنه.

ثم هناك تنازع الجنسيات فانك تجد احدهم يحمل جنسيتين في آن واحد او قل ثلاث جنسيات. فلابد والحالة هذه ان يعاد الى جنسيته الاولى وعلى كل حال فالمهم مايترتب على ذلك الاحصا و والتدقيق من اعمال، وحيث يجب ان تقوم فورا عمليات الاجلاء.

٤- سد باب العمل: لابد لنا مساهمة في الخطة من سد ابواب العمل امام الاكراد حتى نجعلهم في وضع اولا غير قادر على التحرك وثانيا في وضع غير المستقر المستعد للرحيل في اية لحظة وهذا يجب ان ياخذ به الاصلاح الزراعي اولا في الجزيرة بان لا يؤجر ولا يملك اكراد والعناصر العربية كثيرة وموفورة بحمدالله.

٥- شن حملة من الدعاية الواسعة بين العناصر العربية ومركزة على الاكراد

بتهيئة العناصر العربية اولا لحساب ما وخلخلة وضع الاكراد، بحيث يجعلهم في وضع قلق وغير مستقر.

٦- نزع الصفة الدينية عن مشايخ الدين عند الاكراد وارسال مشايخ بخطة مرسومة عربا اقحاحا. او نقلهم الى الداخل بدلا من غيرهم. لان مجالسهم ليست مجالس، دينية ابدا بل وبدقة العبارة مجالس كردية. فهم لدى دعوتهم الينا لايرسلون برقيات ضد البرزاني انما يرسلون ضد سفك دماء المسلمين، واي قول هذا القول.

٧- ضرب الاكراد في بعضهم وهذا سهل وقد يكون ميسورا باثارة من يدعون منهم بانهم من اصول عربية على العناصر الخطرة منهم. كما يكشف هذا العمل اوراق من يدعون بانهم عربا.

٨- اسكان عناصر عربية وقومية في المناطق الكردية على الحدود فهم حصن المستقبل ورقابة بنفس الوقت علي الاكراد يثما يتم تهجيرهم. ونقترح ان تكون هذه العناصر من شمر لانهم اولا افقر القبائل بالارض وثانيا مضمونين قوميا مئة بالمئة.

٩- جعل الشريط الشمالي للجزيرة منطقة عسكرية كمنطقة الجبهة بحيث توضع فيها قطعات عسكرية مهمتها اسكان العرب واجلاء الاكراد وفق ماترسم الدولة من خطة.

١٠- انشاء مزارع جماعية للعرب الذين تسكنهم الدولة في الشريط الشمالي على ان تكون هذه المزارع مدربة ومسلحة عسكريا كالمستعمرات اليهودية على الحدود تماما.

١١- عدم السماح لمن لايتكلم اللغة العربية بأن يمارس حق الانتخاب والترشيح في المناطق المذكورة.

١٢- منع اعطاء الجنسية السورية مطلقا لمن يريد السكن في تلك المنطقة مهما كانت جنسيته الاصلية (عدا الجنسية العربية. الخ..) هذا وان هذه المقترحات ليست كافية بل اردنا منها اثارة المسؤولين بحسب خبرتنا لتكون

تباشير مشروع خطة جذرية شاملة لتؤخذ للذكى بعين الاعتبار[٢٢٨].

کورتەی ئەو (١٢) خاڵە بەم جۆرەیە:

١- ڕاگواستن، بەتایبەتی لە سەرەتاوە ئەوانەی کە زیاتر مەترسییان لێ دەکرێ.

٢- سیاسەتی-تجهیل- : واتە نەکردنەوەی قوتابخانە لە ناوچەکەو ڕێگە گرتن لە خوێندن.

٣- ئەوانەی لە تورکیاوە هاتوون، ناسنامەی سوورییان لێ وەربگیرێتەوە و ڕەوانە بکرێنەوە.

٤- ئیش نەدرێ بە کوردەکان تا بێ ئیش بن و ئاژاوە و ناخۆشییان تێدا بڵاو بێتەوەو ناچاری کۆچ_کردن بن.

٥- پڕوپاگەندە کردن لەناو عەرەبەکاندا لە دژی کوردەکان تا وەزعیان بشێوێ.

٦- ڕێگەی داب و نەریتی ئاینی لەناودارانی ئاینی لەناو کوردمکاندا بگیرێ و بە نەخشەی تایبەت شێخە عەرەبە ڕەسەنەکان بۆ ئەو ناوچانە ڕەوانە بکرێن.

٧- ئاژاوە دروستکردن لە ناو کورداندا، بەجۆرێک هەندێکیان وەکو عەرەب باس بکرێن لەدژی ئەوانەی کە مەترسییان لەسەرە.

٨- نیشتەجێکردنی کەسانی عەرەبی نەتەوەیی لە ناوچە کوردییەکاندا، بە تایبەتی عەشایری (شمر) چونکە خاوەنی زەویوزار نین، تاکو خۆیان بە زەویوزاری کوردەکانەوە بگرن.

٩- ناوچەکانی سەرووی جەزیرە بکرێن بە پایگاو سەربازگە وەکو بەرەی شەڕ سوپای لێ جێگیر بکرێ و خەریکی ڕاگواستنی کوردان و نیشتەجێکردنی عەرەبەکان بن.

١٠- دروستکردنی کێڵگەی هەرەوەزی بۆ عەرەبەکان لەو ناوچانەی کە لە جێگەی کوردەکاندا نیشتەجێ دەکرێن و چەکدار بکرێن وەکو (مستعمرات)ی یەهوودییەکان لەسەر سنوور.

١١- ئەوەی عەرەبی نازانێ مافی خۆ پالاوتن و هەڵبژاردنی نەبێ لە ناوچە کوردییەکاندا.

١٢- بەهیچ جۆرێک (جنسیە)ی سوری نەدرێ بەوانەی کە دەیانەوێ لە ناوچە کوردییەکاندا بژین، تەنیا جنسیە بدرێ بە عەرەب خەڵکی هەر وڵاتێک بێت.

بەڕاستی ئەم پرۆژەیە زۆر بەروونی و ئاشکرایی سیاسەتێکی هەتا بڵێی فاشییانەو کۆلۆنیالیانە دەرهەق بە گەلی کورد دیاری دەکات. لە جێبەجێکردنی تاوانی جینۆسایددا، هەر وەکو پێشتر وتمان تەنیا مەرج نییە کە خەڵکەکە لەڕووی فیزیکییەوە بفەوتێندرێن. سیاسەتی ڕژێمی سوریا فەوتاندنێکی نەتەوەیی، کەلتووری کوردییە. بەپرۆسەیەکی نەخشە بۆ کێشراو و لەسەرخۆ. ڕژێمی سوریا لە واقیعدا پشتی بەهەموو پێشنیارەکان و بیروڕاکانی ئەو پرۆژەیە بەستووەو لە هەموو لایەکەوە گەلی کورد لەو بەشەی کوردستاندا لە (ئاستێکی نزمدا دەژی و دەرامەتی تاکەکەس تەواو بەربادە، هەژاری بەشێوەیەکی زۆر ترسناک ناوچە کوردییەکانی تەنیوەو زاڵ بووە بەسەر خەڵکەکەیدا)[٢٢٩]. ئەو سیاسەتەش گەلێ ئەنجامی خراپ و نائاسایی دروست کردووە لەناو خێزانە کوردەکاندا، بەتایبەتیش زۆر بەخراپی کاری کردووەتە سەر ئاستی ئابووری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی، خەڵکەکە.

سالانی ١٩٧٥-١٩٧٨ ڕژێمی سوریا (١٠٠,٠٠٠) سەد هەزار خێزانی عەرەبی لە غەمرە نیشتەجێ کرد[٢٣٠]. لەگەڵ ڕاگواستن و تەعریب و قەدەغەکردنی زمان و کەلتووری کوردیدا لە سوریا، ناوی گوند و ناوچە و شارەکان لە کوردییەوە کراون بە عەرەبی هەر بۆ نموونە؛ تربە سپی کراوە بە قبور البیض، سەرێ کانی بە رأس العین، چل ئاغا بە جوادیە، دێرک بە مالکیە. شان بەشانی ئەو پرۆسەیەش پڕوپاگەندەی ڕژێم بۆ نەبوونی کورد لە سوریادا لە ئارادایەو پشتگوێ خستنی ئەو ڕاستییەی کە کوردیش وەکو هەر میللەتێکی تر بەگوێرەی هەموو یاساو عورفێکی دونیا مافی ژیانێکی ئاسایی و کامەرانی هەیە، هەردوو کتێبەکەی منذر الموصلی، بەڵگەی ئەو ڕاستییەن.

ئەوەتا منذرالموصلی دەڵێ: (الاكراد يعيشون في الوطن العربي ويتمتعون بحقوق متساوية ويؤدون واجبات متماثلة)[٢٢١].

واتا: (کورد لە نیشتمانی عەرەبدا دەژی و لە ماف و ئەرکیدا یەکسانن) نەک هەر لە سوریا بەڵکو پەل دەهاوێ بۆ عێراق وا پیشان دەدات کە حکومەتی عێراق مافی نەتەوایەتی کوردی پاراستووە[٢٢٢]. لەکتێبی دووەمیشدا منذر الموصلی، بە هەمان شێوە کەوتووەتە شێواندنی مێژوو و واقیعی کورد[٢٢٣]، هەوڵی داوە بەهەر شێوەیەک بێت بوونی بەشێکی کوردستان لە سوریا ڕەت بکاتەوە و دژایەتی کردنی بزووتنەوەی کورد و بەمەترسی زانینی لەسەر عەرەب بخاتە ڕوو[٢٢٤].

لە ماوەی نێوان ٥-٢٣/٨/١٩٩١، لە جنێڤ لیژنەی بەربەندکردنی جیاوازی ڕەگەز لە UN لە کۆبوونەوەی چواردەهەمینیدا، دەربارەی چاودێری جێبەجێ کردنی پەیمانی جیهانی لەدژی جیاوازی ڕەگەز، لەبارەی بەندی شەشەمینی ئەو پەیمانە پرسیار لە نوێنەری سوریا کرا، کە ئاخۆ کوردەکان، یا ئەوانەی بە ڕەچەڵەک کوردن، هەست بەوە دەکەن لەڕووی ڕەگەزەوە جیاواز دەکرێن، یا ئەوەتا نوێنەری سوریا ئاگاداری وەزعیان نییە؟ نوێنەری دەوڵەتی سوریا لە وەلامدا وتی؛ کێشەی کورد لە سوریادا نییە، کوردەکانی سوریا بەئارەزووی خۆیان بەتەواوی تێکەڵی کۆمەڵگەی سوری بوونەو جیاواز ناکرێن[٢٢٥]. دیارە نوێنەری سوریا لەکاتێکدا ڕاستی دەشارێتەوە کە هەتا ئێستاش زمان و کەلتووری کوردی لە سوریا قەدەغەن و بەهەزاران کورد بێ ناسنامە لە ژیانێکی سەختدا دەژین.

پەرلەمانی ئەورووپی لە بڕیاری خۆیدا ١٢/حوزەیرانی ١٩٩٢ لەسەر هەر چوار پارچەی کوردستان لە خاڵی٢٣/دا (داوا لە سوریا دەکات کۆتایی بە ستراتیژی تەعریب بێنێ، بارودۆخی عەسکەری لەناوچە کوردنشینەکاندا نەهێڵێ، دەست بەدیموکراتیزە کردن و سازدانی هەڵبژاردنی ئازاد و دیموکرات بکات و بەزووترین کات زیندانە سیاسییەکانی ئازاد بکات کە زۆریان هەرزەکار و لاوی کوردن)[٢٢٦]. هەروەها پەرلەمانی ئەورووپی لەڕۆژی

١٦/ژووئیەی ١٩٩٣دا دەربارەی هەرچوار پارچەی کوردستان بڕیارێکی تری دەرکردووە. کە دێتە سەر سوریا دەڵێ: (بە لەبەرچاو گرتنی ئەو سیاسەتە سەرکوتکەرانەیە کە لەدژی کوردەکانی سوریا بەڕێوە دەچێ) دوایی لەدوای ڕوونکردنەوەی وەزعی پارچەکانی تری کوردستان لە خاڵی دووەمدا پەرلەمان دەڵێ: (شێلگیرانە داواکاری ئەوەین تا لەهەموو دەوڵەتان بەجیددی داوابکرێ کە مافە دیموکراتیک و فەرهەنگییەکانی کوردەکان لە وڵاتانی خاوەن کورددا بەڕەسمی بناسن بێ دواکەوتن هەنگاوی پێویست بۆ کۆتایی هێنان بە پێشێلکردنی مافە ئینسانییەکان هەڵبگرن).[٢٣٧]

ڕژێمی سوریا بەشدارە لە هاوکاری کردنی ڕژێمەکانی تری داگیرکەری کوردستان لەدژی گەلی کورد. ئەوەتا ١٩٩٣/٢/١٠ وەزیرانی دەرەوەی ئێران و تورکیاو سوریا لە دیمەشق کۆبوونەوە، بەبیانووی پاراستنی یەکێتی خاکی عێراق[٢٣٨]. بەڵام مەبەستی سەرەکی ئەو کۆبوونەوەیە پلان دانانە بۆ تێکدانی ئەو حکومەتە کوردییەی کە لەخوارووی کوردستان، لە چوارچێوەی عێراقدا دروست بووە. پێویستە ئەوە بڵێین بەگوێرەی بڕیاری ژمارە (٦٨٨)ی UN، ناوچەیەکی ئاسایش لە زۆربەی ناوچەکانی خوارووی کوردستان دروست بووە و لەژێر چاودێری چاودێرانی UN دوور لە دەسەڵاتی ڕژێمی عێراق هەڵبژاردن کراوەو پەرلەمانێکی کوردی و پاشتریش ئەنجومەنی وەزیران دامەزران، لە چوارچێوەی عێراقدا. ئەگەر چی عێراق هەمیشە بەردەوامە و هەوڵ دەدات وەزعەکە بشێوێنێ. حکوومەتەکانی سوریاو تورکیاو ئێرانیش زۆر سەغڵەتن بەوەی کە گەلی کورد حکوومەتی دامەزراندووە. مەترسییان لێ نیشتووە کە کار دەکاتە سەر بەشەکانی تری کوردستان.

***

ئەو فاکتانەی خستمانە ڕوو لە ناوچەکانی کوردستان، ئەوەی تورکیا و سوریا، عێراق و ئێران دەیکەن، ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ کە گەلی کورد فەوتاندنێکی بەردەوام هەڕەشە لەپاشەڕۆژی دەکات. سیاسەتی وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان خراپترە لە سیاسەتی وڵاتێکی کۆلۆنیالی دەرهەق

بە خاکی کۆلۆنیالکراو. ئیتر ئەو ڕژێمانە جگە لەوەی هەر لایەو بەرنامەی تایبەتی هەیە بۆ ڕاگواستن و کوشتن و تالانکردن و تواندنەوەی گەلی کورد، بەردەوامیش هاوبەشن لەگەڵ یەکدا. سوپا و ئابوورییەکی بێ شوماریان لە دژی گەلی کورد خستووەتە کار، (هەر کاتێکیش بزووتنەوەی کورد ئەشونومای کردبێ یان مەترسی بۆ هەریەک لەو ڕژێمانە نابێتەوە، هاوکاری ئاشکرایان بە دزی لە نێوان ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەدا بۆ بەرگری خەباتی کورد پیادە کراوە)[٢٣٩].

کەواتە هاوبەشی نێوان وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان، سیاسەتێکی دیار و ستراتیژێکی گرنگە، چونکە بەرژەوەندی ئەو وڵاتانە لە دژایەتیکردنی گەلی کوردا یەک دەگرێتەوە. هەر یەکێک لەو وڵاتانە ئەو بەشەی کوردستان کە پێوەی لکێندراوە، بەهیچ جۆرێک بەخاکی گەلی کوردی نازانێ و کوردیش وەکو گەلێکی سەربەخۆ ناناسێ، بۆ هەمان مەبەست د. کەمال میراودەلی ڕاستی بۆ چووە کە دەڵێ: (ڕژێمە داگیرکەرەکان بەروبووم و داهاتی کوردستان بۆ بەهێزکردنی سوپای داگیرکردن و دامەزراوەو پرۆژە کۆلۆنیالییەکان بەکار دەهێنن، هەر جۆرە دەرفەتێکی پێشکەوتن و پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەلایەتی و کەلتووریان لە گەلی کورد بڕیوەو لە حاڵەتی داچووندا هێشتوویانەتەوە)[٢٤٠].

ئێمە گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە لە بەشەکانی کوردستاندا مێتۆدی هەمە چەشنە بەکاردێت بۆ جێبەجێ کردنی سیاسەتی ئەو ڕژێمانە. ئیتر جۆری سیاسەتی جینۆساید لە ڕۆژئاوای کوردستان جیاوازە، وەک لە بەشەکانی تری کوردستان، یا لەهەر سەردەمە و قۆناغێکدا ڕژێمە داگیرکەرەکان بەچەند جۆرێکی جیاواز هەوڵی فەوتاندن و زەبر پێگەیاندنی گەلی کورد دەدەن. ئەو ڕاستییانەی کە خستمانە ڕوو، بەشێکن لەو تاوانانەی لەدژی گەلی کورد ئەنجام دەدرێن، تەنیا وردبوونەوە لەو تاوانانە دەمان گەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە جینۆساید هەر چوار بەشی کوردستانی گرتووەتەوە.

## پەراوێزەکانی بەشی دووەم


١- م. س. لازەریف: کورد و کوردستان. کتێبی مەسەلەی نەتەوایەتی لە وڵاتە ڕزگاربووەکانی ڕۆژهەڵاتدا. مۆسکۆ، ١٩٨٦ ل٦٠-٦١ بەزمانی ڕووسی.

٢- د. ئیسماعیل بەیشکچی: کوردستان-کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی. وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە: ڕێبوار ڕەشید. هەولێر ١٩٩٢، ل٢١.

٣- لقاء مع المؤرخ الكردي جليلي جليل/ جريدة الشعب - كەل - العدد ١٨ أوائل أيلول ١٩٨٥ ص ٤.

٤- بەراییەک لە فەلسەفە، بەشی دووەم. مۆسکۆ، ١٩٨٩، ل ٢٢٢ بە زمانی ڕووسی.

٥- دکتۆر عەزیز شەمزینی: جووڵانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان. ف. ئەسەسەرد لە عەرەبییەوە وەری گێڕاوە. چاپی دووەم، ١٩٨٥، ل١١٧.

٦- پ. دیمچێنکە: کوردستانی عێراق لە ئاگردا. مۆسکۆ، ١٩٦٣، ل٣٢ بە زمانی ڕووسی.

٧- گ. د. ئەلیبێلی: ئێران و وڵاتە دراوسێکانی ڕۆژهەڵات. مۆسکۆ، ١٩٨٩، ل١٤١ بە زمانی ڕووسی.

٨- ش. خ. مگۆیی: مەسەلەی نەتەوایەتی کورد لە عێراق لە تازەترین سەردەمدا. مۆسکۆ، ١٩٩١، ل٢١٦-٢١٧ بە زمانی ڕووسی.

٩- ئەو تاوانانەی کە لەبیر ناچنەوە. خەبات. ژ: ٦٣٧، ١٩٩٢/٩/٩، ل١١.

١٠- ش. ج. اشيريان: الحركة الوطنية في كردستان العراق. ١٩٦١- ١٩٦٨، عربه عن الروسية: ولاتو. بيروت ١٩٧٨ ص ١١٠.

١١- ئەو تاوانانەی کە لەبیر ناچنەوە. خەبات. ژ: ٦٣٧، ل١١.

١٢- محمد سعید سۆفی: کەندێناوە و سیاسەتی تەعریب و ڕاگواستن. کوردستانی نوێ. هەولێر، ژ: ١٥٤، ١٩٩٢/٨/٢، ل٢.

١٣- ج. نەبەز: کوردستان و شۆڕشەکەی. کوردۆ لە ئەڵمانییەوە کردوویەتی بەکوردی، ستۆکهۆڵم ١٩٨٥، ل٢٢٤.

١٤- ج. نەبەز: هەمان سەرچاوە. ل٢٣٤.

١٥- زينية موريس: كردستان أو الموت. ترجمة جرجيس فتح الله المحامي. لندن ١٩٨٦، ص ٥٢.

١٦- م. داڤيد: كورد. راپۆرتی ژماره ٢٣. لەندەن ١٩٨٩، ل٢٠، بەزمانی ئینگلیزی.

١٧- م. داڤيد: هەمان سەرچاوە. ل٢٨.

١٨- ش. ج. أشيريان: الحركة الوطنية الديمقراطية في كردستان العراق. بيروت، ١٩٨٩، ص١٠٦.

١٩- ميشيل عفلق: نقطة البداية. بيروت ١٩٧٤، ص١٠٨. بڕوانە: كمال غمبار: القضية الكردية من وجهة نظر حزب البعث. جريدة الشعب العدد ٥٠ أب ١٩٩٢ ص٢.

٢٠- ج. نەبەز: كوردستان و شۆڕشەكەی. ستۆكهۆڵم ١٩٨٥، ل٢٩٢. هەروەها ج. نەبەز: ئێستەو پاشەڕۆژی نەتەوەی كورد لەبەر ئاگری جەنگی عێراق و ئێراندا. ستۆكهۆڵم ١٩٨٩، ل٨٨. هەروەها: خەبات. ژ: ٦٣٧، ل١١.

٢١- خەبات. ژ: ٦٣٧، ل١١.

٢٢- راپۆرتی ڕێكخراوی كۆمەڵەی هاوكاری كردنی گەلانی چەوساوە. ژ ٤. ١٩٩١، گویتنگن. ل٤٣.

٢٣- الشرارة. العدد ٧ تموز ١٩٨٩، ص٨.

٢٤- نداء و الي الرأي العام الاوروبي والعالمي. الحزب الديمقراطي الكردستاني، فرع اوروبا، ٤ كانون الثاني ١٩٧٤.

٢٥- كۆمەڵەی هاوكاریكردنی گەلانی چەوساوە. راپۆرتی ژ ٤، ل٢٤.

٢٦- مارف عومەر گوڵ: كورد قڕان و یاسای نێودەوڵەتان/گۆڤاری بەربانگ. ستۆكهۆڵم، ١٩٩٠، ژ٦٦، ل٤٦.

٢٧- گ. د. ئەلیبێلی: ئێران و وڵاتە دراوسێكانی ڕۆژهەڵات. مۆسكۆ، ١٩٨٩، ل١٤٦ بەزمانی ڕووسی.

٢٨- العفو الدولية تفضح انتهاكات حقوق الانسان في العراق/ حقوق الانسان: نشرة دورية تصدرها لجنة الدفاع عن حقوق الانسان في العراق. العدد ١٦، أب ١٩٩١، ص ١٢-١٣، هەروەها: اخبار كردستان: العدد ١٧١، ١٩٨٨/٢/١.

٢٩- عبدالرقیب یوسف: بانگەوازێک بۆ ڕووناكبیرانی كورد. سلێمانی ١٩٨٥، ل٢٢.

٣٠- عبدالرقیب یوسف: هەمان سەرچاوە. ل٦١.

٣١- سووتاندنی قەیسەری نەقیب بەشێكە لە سیاسەتی وێرانكردنی كوردستان/ ڕۆژنامەی ڕێبازی نوێ ژ ١٠ تشرینی یەكەمی ١٩٨٨، ل١.

٣٢- قرار المؤتمر العاشر للجمعية العالمية للدفاع عن اللغات والحضارات المهددة، جريدة الشعب العدد ١٧ن أوائل أب ١٩٨٥، ص٩.

٣٣- قەسابخانەیەکی گەورە لە زیندانەکانی-ئەبو غریب-دا/ گۆڤاری پێشەنگ ژ ١٢، ئاب ١٩٨٦، ل٣٢-٣٣.

٣٤- جەمال نەبەز: ئێستەو پاشە ڕۆژی نەتەوەی کورد لەبەر ئاگری جەنگی عێراق و ئێراندا. ستۆکهۆلم ١٩٨٩، ل٩٢.

٣٥- قنابل ولعب، جريدة الشعب العدد ٢٠-، كانون الثاني ١٩٨٦، ص ٨.

٣٦- النظام الفاشي الشوفيني يقترف جريمة غلق اكثر من ٧٧٦ مدرسة في كردستان، جريده الشعب العدد ٢٠ كانون الثاني ١٩٨٦، ص٨.

٣٧- ئەمنستی ئینتەرناشیونال MDE 14/03/ 89

٣٨- المجموعة الاوروبية. المجلس. بروكسل، ١٣/ ٤/ ١٩٨٧ تسلسل ٥٩٥٥/٨٧، قرار بشأن اعتقال وتعذيب الاطفال في العراق، گۆڤاری هەڵوێست. ژ٣، لەندەن ١٩٨٧، ل١٦١.

٣٩- چیا: ئەمنی ستراتیجی عێراق و سێ کۆچکەی بەعسییان: تەرحیل، تەعریب، تەبعیس. چاپی یەکەم ١٩٨٧، ل٢٣٢.

٤٠- چیا: هەمان سەرچاوە. ل٢٥٧.

٤١- چیا: هەمان سەرچاوە. ل٢٨٤.

٤٢- الدكتور نوري طالباني: كردستان- الحقوق القومية والفيدرالية والدستور، جريدة المنار الكردي. العدد ٨ لندن ايلول ١٩٩٣، ص٥.

٤٣- ج. نەبەز: ئێستەو پاشەڕۆژی نەتەوەی کورد لەبەر ئاگری جەنگی عێراق و ئێراندا. ستۆکهۆلم ١٩٨٩، ل٩٤.

٤٤- ڕۆژنامەی پراڤدا: ژمارە ٩٣، ٣/ ٤/ ١٩٩٠، ل٣.

٤٥- ڕۆژنامەی خەبات. ژمارە ٥٧٥، کانوونی دووەم ١٩٨٨، ل١٨.

٤٦- بەربانگ ژمارە ٥١، ستۆکهۆلم، ٣٠/ ٦/ ١٩٨٨، ل٤١.

٤٧- حلبجة-المدينة الدامية. الجزء الاول. منشوارت المكتب الاعلامي للحزب الاشتراكي الكردستاني- العراق/ فرع السليمانية ١٩٨٩.

٤٨- بەڵگەنامەی CD/872.12 September 1988 UN کۆنگرەی چەک داماڵین/ دەقی

ڕووسی.
49- Documentation of the international conference on Human Rights in Kurdistan. 1989 Bremen. P. 219-225
٥٠- بەڵگەنامەی E/CN. 4/Sub. 2/1988 UN
٥١- ألف باء . بغداد العدد ١٠٤٢، ٢ ايلول ١٩٨٨، ص٧.
٥٢- یاسای نێودەوڵەتان لە بەڵگەناماندا . مۆسکۆ، ١٩٨٢، ل٨٣٢ بەزمانی ڕووسی.
٥٣- دادگای نۆرنبێرگ. ٨ بەرگ، بەرگی یەکەم. مۆسکۆ، ١٩٨٧، ل٩٠-٩١ بەزمانی ڕووسی.
٥٤- هەمان سەرچاوە. ل١٠٤-١٠٥.
٥٥- هەمان سەرچاوە. ل١٤٦.
٥٦- یاسای نێودەوڵەتان لە بەڵگەناماندا . مۆسکۆ، ١٩٨٢، ل٨٣٢.
٥٧- هەمان سەرچاوە. ل٧٣٤.
٥٨- هەمان سەرچاوە. ل٢٣٢.
٥٩- بەڵگەنامەی E/CN. 4/1992/31. 18 February 1992. P. 27 UN دەقی ڕووسی.
٦٠- هەمان ڕاپۆرت. ل٢٧.
٦١- هەمان ڕاپۆرت. ل٢٨-٢٩.
٦٢- ئەڵمانیاو جینۆساید لە عێراق. کۆمەڵەی هاوکاریکردنی گەلانی چەوساوە. ڕاپۆرتی ژمارە ٤، ١٩٩١، لە ٤٥-٤٦ بەئەڵمانی و ئینگلیزی.
٦٣- هەمان سەرچاوە. ل٤٦.
٦٤- رسالة العراق. الحزب الشيوعي العراقي. اعلام الخارج. العدد ٩٩، تموز/١٩٨٩، ص ١٨.
٦٥- تقرير فان دير ستويل حول حقوق الانسان فى العراق، المنار الكردي. العدد ٥. لندن، ١٩٩١، ص٥.
٦٦- لە گوندی هۆمرملی دەشتی گەرمیانەوە، چەند بیرەوەرییەکی تاڵ: ر. خەبات. ژ. ٦٣٨، هەولێر ١٦/٩/١٩٩٢، ل٦.
٦٧- بەڵگەنامەی UN ئەنجومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی: 31 P.72 E/CN. 4/ 1992/ هەروەها بەڵگەنامەی UN ئەنجومەنی ئاسایش: S/ 23685/ Add. 1, 9 March

1992 P-75 دهقی ڕووسی.
٦٨- وثائق، عن محنة شعب كردستان العراق (٢). قسم الاعلام في المكتب السياسي للحزب الديمقراطي الكردستاني- العراق، ١٩٨٨، ص١٩.
٦٩- قرار حزب البعث العربي الاشتراكي. قيادة شعبة زاخو. العدد س/ش/٦٦٤ التاريخ ١٤/٦/١٩٨٧.
٧٠- گۆڤاری هەڵوێست. ژمارە ٢ لەندەن ١٩٨٧، ل١٥٨.
٧١- بەڵگەنامەی E/CN. 4/ 1993/ 45. P. 80 UN.
٧٢- الوقائع العراقية. العدد ٣١٥٨ في ١٢/تموز/١٩٨٧.
٧٣- ڕێبازی نوێ. ژمارە ١٠ تشرینی یەکەمی ١٩٨٨، ل٢.
٧٤- ڕێبازی نوێ. ژمارە ٤، نیسانی ١٩٨٩، ل١٦. دەقی ڕاپۆرتی پەرلەمانی ئەورووپی.
٧٥- تقرير خاص الى الكونغرس الامريكي حول استخدام الاسلحة الكيمياوية. ترجمة امانج. مطبعة الشهيد صالح اليوسفي. ١٩٨٨، ص٥-٦.
٧٦- هەمان سەرچاوە. ل٤٦.
٧٧- ڕێبازی نوێ. ژمارە ١٠ تشرینی یەکەم ١٩٨٨، ل٣.
٧٨- سەرژمێری گشتی دێهات و شارۆچکە وێرانکراوەکانی پارێزگای کەرکووک. ١٩٨٧-١٩٨٨، ڕاگەیاندنی لقی کەرکووکی حیزبی سۆسیالیستی کوردستان- عێراق، ١٩٨٩.
٧٩- د. عبدالباقي احمد: حقائق عن اللاجئين العراقيين الاكراد في تركيا. ترجمه: فريدون فەيزەلك. منشورات الجبهة الكردستانية ١٩٨٩، ص ٦٧.
٨٠- دوای دەربەدەرکردن، دەرمانخوارد کردن/ بەربانگ. ژمارە ٥٧ و ٥٨، ستۆکهۆڵم ١٩٨٩، ل٧١.
81- News From Helsinki Watch. News from Turkey. New York 1990. P. 16-17.
82- Amnesty international News release-MED 14/ 01/ 88
٨٣- الشرارة. العدد ٣ أذار ١٩٨٩، ص٤.
٨٤- سەردەمی نوێ. ژمارە ١٠ ستۆکهۆڵم ١٩٨٩، ل١.
٨٥- الشرارة. العدد ٣ أذار ١٩٨٩، ص٤.

٨٦- مذكرة الجبهة الكردستانية العراقية. منشورات الجبهة الكردستانية ١٩٨٩، الملحق، ص ١-٢٦.
٨٧- مذكرة الجبهة الكردستانية. الملحق ص ٢٩.
٨٨- كۆمەڵێ بەڵگەنامەی: Kurdistan Human Rights Commision Maastricht. 1992/ Doc.3
٨٩- هەمان سەرچاوە. ل١٦.
٩٠- هەمان سەرچاوە. ل١٧.
٩١- بەڵگەنامەی UN ئەنجومەنی ئابووری و كۆمەڵایەتی: P.82 E/Cn. 4/1993/45.
٩٢- كۆمەڵێ بەڵگەنامەی: Kurdistan Human Rights commision Maastricht 1992/ Doc.3/
٩٣- لیژنەی باڵای ئاوارەكانی كوردستانی عێراق. نەخشەو ئاماری سەرژمێری ئاوارەكان لە ئوستانەكانی ئێراندا. ئابی ١٩٨٩.
94- Jeremy Webb. Iraq caught out over nerve gas attack/ New Scientist-London 1 May. 1993. P.4
٩٥- ادانة عالمية لنظام صدام. ولكن؟ / طريق الحرية. جريدة الحزب الاشتراكي الكردستاني/ العراق. العدد ١٢-١٤، تشرين الثاني ١٩٨٨، ص ٣-٤.
٩٦- الدكتور مصطفي سلامة حسين: تأملات دولية في حقوق الانسان، المجلة المصرية للقانون الدولي. المجلد الاربعون. القاهرة ١٩٨٤، ص ١٩٨.
97- Hussein Saado: Document on the UN& the kurdish Question/ Doucumentation of the International Conference P. 171-179.
٩٨- صدى كردستان. العدد ٣٢ اوائل تموز ١٩٩٠/جريده الحزب الديمقراطي الكردستاني- العراق. مكتب لبنان. ص٣.
٩٩- مارف عومەر گوڵ: ڕێكخراوی كوردی مافی مرۆڤ لە كوردستان/ ڕۆژنامەی دەنگی كورد- گۆڵەس كوردا، ژمارە ٥-٦، مۆسكۆ ١٩٩٢، ل٢ بەزمانی ڕووسی.
١٠٠- شهادات تفضح انتهاكات حقوق الانسان في العراق- اصدار لجنة الدفاع عن حقوق الانسان في العراق. دمشق، ١٩٩٠، ص ٧١.
١٠١- كوردستانی نوێ. ژمارە ٩٥، ١٨/٥/١٩٩٢، ل١.

١٠٢- بەڵگەنامەی UN، ئەنجومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی: E/CN.4/ 1993/45. P.27.

١٠٣- الكشف عن مقبرة جماعية قرب اربيل/طريق الشعب- الجريدة المركزية للحزب الشيوعي العراقي. العدد ٧ اواسط تشرين الاول ١٩٩١، ص١.

١٠٤- دۆزینەوەی گۆڕێکی بەکۆمەڵ لەسەر ڕێی موسڵ-دهۆک/ڕێبازی نوێ ئۆرگانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان. ژمارە ٤، ١٧ تشرینی دووەم ١٩٩١، ل١.

١٠٥- حقوق الانسان: نشرة دورية تصدرها لجنة الدفاع عن حقوق الانسان في العراق. العدد ١٨ كانون اول ١٩٩١، ص١٥.

١٠٦- دۆزینەوەی گۆڕستانێکی شەهیدانی ڕاپەڕین لە سلێمانی/کوردستانی نوێ چاپی دەولی. لەندەن. ژمارە ٤، تشرینی یەکەم ١٩٩٤، ل٢.

١٠٧- بەڵگەنامەی UN ژ: E/CN. 4/1993/45. P. 33. 34:

١٠٨- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ نێردراوی UN بۆ عێراق: ڤان دیر ستویل/ ڕۆژنامەی یەککگرتن. ئۆرگانی ناوەندی حیزبی یەککگرتنی کوردستان ژمارە ٩، کانونی دووەمی ١٩٩٣، ل٥.

١٠٩- أمر مديرية امن محافظة دهوك. العدد ٤٨، التاريخ ٦/٣/١٩٩١.

١١٠- نشرة اخبارية: المنظمة العربية لحقوق الانسان. العدد ٤٩، كانون الثاني ١٩٩٢، ص٩.

١١١- هەر لەوان دەوەشێتەوە/کوردستانی نوێ. ژمارە ٧٦، هەولێر ٢٦/٤/١٩٩٢، ل٨.

١١٢- گۆڤاری سیاسەتی دەولی. هەولێر ژمارە ٤، ١٩٩٣، ل١٠١.

١١٣- م. س. لازريف: الاكراد والقضية الكردية. ترجمة: س. ولات/ جريدة الشعب (گـەل)، العدد ٨ حزيران ١٩٨٤ ن ص٥. هەروەها: م. س. لازەریف کورد و کوردستان/ کتێبی: مەسەلەی نەتەوایەتی لە وڵاتە ڕزگاربووەکانی ڕۆژهەڵاتدا. مۆسکۆ ١٩٨٦، ل ٤٢-٤٤ بەزمانی ڕووسی.

١١٤- یاداشتەکانی مەیجەر نوئیل لە کوردستان. وەرگێڕانی: حسین احمد جاف و حسین عثمان، نێرگسە جاڕی، بغداد ١٩٨٤، ل٢٤.

١١٥- د. ئیسمایل بەێشکچی: کوردستان- کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی. وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: ڕێبوار ڕەشید. هەولێر ١٩٩٢، ل٢٢.

١١٦- هەمان سەرچاوە. ل٦٥.

١١٧- دەســــتـــووری وڵاتانـی ڕۆژهـەڵاتی نـاوەڕاسـت و نزیـک./ وەرگــێــڕانـی بـە سەرپەرشتی: ی. د. لیڤین/ مۆسکۆ ١٩٥٦، ل٥١٢ بەزمانی ڕووسی.

١١٨- كندال نزان: اكراد تركيا: الاضطهاد القومي واشكاله/ دراسات كردية. العدد ١-٢ باريس، كانون الثاني ١٩٨٥، ص٦٦-٦٨.

١١٩- دکتۆر عەزیز شـەمزینی: جووڵانەوەی ڕزگاری نیشـتـمـانی کوردسـتـان. ف. ئەسـەسـەرد لە عەرەبییـەوە وەری گێڕاوە. چاپی دووەم؟ ئـەیلولی ١٩٨٥، ل ٩٥-٩٨.

هەروەها بڕوانە: گ. پەیف. ژمارە ٤ لەندەن. نیسانی ١٩٨٧، ل٦٢٠ هـەروەها: د. وليد حمدي: الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية. لندن. ١٩٩٢، ص ٣٧٤.

١٢٠- اسماعيل بيشكچي: دفاعا عن الامة الكردية المستعبدة - رسالة الي يونسكو- القسم الخامس. ترجمة: رووناك/ جريدة الشعب، العدد ١٩، اواخر تشرين الاول، ١٩٨٥، ص٢.

١٢١- دەستووری وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و نزیک/ وەرگێڕانی بە سەرپەرشتی ی. د. لیڤین/مۆسکۆ ١٩٥٦، ل٥١٥.

١٢٢- دكتور مجيد جعفر: كردستان تركيا- دراسة اقتصادية اجتماعية سياسية في تحت التخلف الاستعماري-بيروت ١٩٩٠، ص٦.

١٢٣- هەمان سەرچاوە. ل٦.

124- Hussein Saado: Document on the UN and the Kuedish Question/ Documentation of the international Conference P. 171-179

١٢٥- م. ئە. گـەسـرەتيـان: کوردەکـانی تورکـیـا لە تازەترین سـەردەمـدا. یەریڤـان، ١٩٩٠، ل١٠٦ بەزمانی ڕووسی.

١٢٦- د. وليد حمدي: الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية. لندن. ١٩٩٢، ص ٢٦٣- ٢٦٥.

١٢٧- گەسرەتيان: هەمان سەرچاوە. ل١٠٦.

١٢٨- گەسرەتيان: هەمان سەرچاوە. ل١٢٥.

١٢٩- عەبدوڵڵا قەرەداغی (مەلا عەلی): ڕاگوێزانی کورد لە مێژوودا. سوید ١٩٩١،

ل٤٦.

١٣٠- جەمال نەبەز: کوردستان و شۆڕشەکەی. کوردۆ لە نەڵمانییەوە کردوویەتی بەکوردی. ستۆکهۆڵم، ١٩٨٥، ل١٠٢.

١٣١- جەمال نەبەز: هەمان سەرچاوە، ل١٠٣.

١٣٢- دکتۆر بلەج شێرکۆ: کێشەی کورد، مێژینەو ئێستای کورد. محەمەد حەمە باقی لە عەرەبییەوە کردوویە بەکوردی. چاپی دووەم، سەقز، ١٩٩٠، ل٨٥.

١٣٣- گەسرەتیان: هەمان سەرچاوە. ل١٢٨-١٢٩.

١٣٤- ف. نیکیتین: کورد. مۆسکۆ ١٩٦٤، ل٩٠ بەزمانی ڕووسی.

١٣٥- گەسرەتیان هەمان سەرچاوە. ل١٣٣.

١٣٦- دکتۆر بلەج شێرکۆ: هەمان سەرچاوە. ١٠٥-١١٤.

١٣٧- گەسرەتیان: هەمان سەرچاوە. ل١٤٥.

١٣٨- گەسرمتیان: هەمان سەرچاوە. ل١٥٩.

١٣٩- د. وليد حمدي: الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية. ص٢٧٢.

١٤٠- گەسرەتیان: هەمان سەرچاوە. ل١٦٨.

١٤١- کریس کوچیرا: مێژووی کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست- دا. وەرگێرانی: محمد ریانی. تاران ١٩٩٢، ل١٧٦-١٧٧.

١٤٢- الدكتور عبدالرحمن قاسملو: كردستان والاكراد. ترجمة: ثابت منصور؟ ١٩٦٨، ص٥١.

١٤٣- دکتۆر عەزیز شەمزینی: هەمان سەرچاوە. ل. ١٠٠-١٠١.

١٤٤- دکتۆر عەزیز شەمزینی: هەمان سەرچاوە. ل١٠٢.

١٤٥- جەمال نەبەز: کوردستان و شۆڕشەکەی. ل١٠٤.

١٤٦- د. عەزیز شەمزینی: هەمان سەرچاوە. ل١٠٢.

١٤٧- سیاسەتی نێودەوڵەتان لە تازەترین سەردەمدا لە ڕێکەوتننامە و یاداشت و بەیاننامەدا/ سەرپەرشتکاران: یو. ف. کلوچنیکەف، ئە. ف. سەبەنین/ بەشی٢، مۆسکۆ ١٩٢٩، ل٢١٠-٢١١ بەزمانی ڕووسی.

١٤٨- هەمان سەرچاوە: ل٢٠٤-٢٠٥.

١٤٩- گەسرەتیان: هەمان سەرچاوە. ل١٧٥.

١٥٠- گەسرەتیان: هەمان سەرچاوە. ل٢٠٩-٢١٠.

١٥١- گەسرەتیان: هەمان سەرچاوە. ل١٧٦.

١٥٢- م. أ. هسرتیان: کردستان ترکیا بين الحربين. ترجمة: د. سعدالدين ملا، بافق نازی. بیروت ١٩٨٧، ص١٧٠.

١٥٣- جەمال نەبەز: کوردستان و شۆڕشەکەی. ل١٠٩.

١٥٤- دکتۆر مەجید جەعفەر: کردستان ترکیا. ل١٨٢.

١٥٥- د. مجيد جعفر: كردستان تركيا. ل١٨٢-١٨٤.

١٥٦- گەسرەتیان: کوردەکانی تورکیا. ل٢٠٧.

١٥٧- هەمان سەرچاوە. ل٢٠٧-٢٠٨.

١٥٨- كندال نزان: اكراد تركيا/ دراسات كردية. العدد ١-٢ باريس ١٩٨٥، ص٦٧.

١٥٩- گەسرەتیان: دەستووری تازەی تورکیاو مەسەلەی کورد/ کتێبی: تورکیاو سەردەم. کۆمەڵێ وتار. مۆسکۆ، ١٩٨٩، ل٨٩ بەزمانی ڕووسی

١٦٠- گەسرەتیان: دەستوری تازەی تورکیا و مەسەلەی کورد. / هەر ئەوێ. ل٨٩.

١٦١- حميد بوز ارسلان: حول (الاطروحة التركية في التاريخ)/ دراسات كردية. العدد ٣-٧ باريس ١٩٩٢، ص٣١.

١٦٢- مەهاباد کوردی: گەشتێک بۆ باکوری کوردستان. سوید ١٩٩١، ل٧٣.

١٦٣- ميري كوجار: الاكراد والمسألة الكردية في علم التاريخ التركي. / مجلة: الثقافة الجديدة. العدد ١٧٢، نيسان ١٩٨٦، ص٣١-٤١.

١٦٤- الفولكلور الكردي: تهديد لوحدة تراب تركيا./ جريدة الشعب. العدد ٢٠، كانون الثاني ١٩٨٦، ص٧.

١٦٥- دەستووری وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و نزیک. مۆسکۆ. ١٩٥٦، ل٥١٥ بەزمانی ڕووسی.

١٦٦- گەسرەتیان: کوردەکانی تورکیا. ل١٣٣

١٦٧- ی. براونلی: یاسای نێودەوڵەتان. کتێبی دووەم. مۆسکۆ. ١٩٧٧، ل١٤ بەزمانی ڕووسی.

١٦٨- عصمت شريف وانلي: حول الاستراتيجية السياسية والعسكرية للحركة الوطنية الكردية./ دراسات كردية. العدد ١-٢ باريس. كانون الثاني ١٩٨٥، ص١٧.

169- News From Helsinki Watch.News From Turkey. New York. June 1990. P.2

هەروەها بڕوانە: یاسای کورد قڕکردن/ڕۆژنامەی سەربەخۆیی. ئۆرگانی ناوەندی پارتی سۆسیالیستی کورد. پاسۆک. ژمارە ٢٤-٢٥ تەمموزو ئابی ١٩٩٠، ل٩.

170- News From Helsinki Watch. P. 9-11

١٧١- الدكتور جبار قادر: الدستور التركي وسياسة قهر الاكراد/ جريدة المنار الكردي. العدد ٢٠، ٢٢ تشرين الاول ١٩٩٤، ص٣.

١٧٢- دۆستی: کیدری و باری سیاسی کوردستانی سەروو/ گۆڤاری هەڵوێست. ژمارە ٢، لەندەن ١٩٨٤، ل٨٢-٨٨.

١٧٣- منظمة العفو الدولية-التقرير السنوي. لندن ١٩٩١، ص١٠١- ١٠٤.

١٧٤- سياسة ابادة الجنس الكردي في تركيا/ كردستان اليوم. نشرة دورية تصدرها لجنة التضامن مع الشعب الكردي. العدد السابع. بروكسل. نيسان ١٩٨٩، ص١٠-١٥.

١٧٥- سەربەست کەرکووکی: لێکۆڵینەوەیەکی سەرپێیی دەربارەی پەرلەمانی ئەوروپا/ گۆڤاری سیاسەتی دەولی. ژمارە ٤، هەولێر ١٩٩٣، ل٩٣-١٠٥.

١٧٦- بانگەوازێکی جیهانی بۆ پشتگیری کردنی گەلی باکووری کوردستان. وەرگێڕانی. نەزەند بەگیخانی/ ڕۆژنامەی هەنگاو، لەندەن، ١٩٩٤، ژمارە ٦، ل١٢.

١٧٧- عەبدلرەحمان قاسملۆ: چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی. بەرگی یەکەم. چاپی دووەم؟ ١٩٨٨، ل٢٣.

١٧٨- وليام ايغلتن الابن: جمهورية مهاباد. ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله المحامي: بيروت، ١٩٧٢، ص٣٢.

١٧٩-عەبدلرەحمان قاسملۆ: چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی. ل٢٦.

١٨٠- الدكتور كمال مظهر احمد: دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر. بغداد ١٩٨٥، ص ٢٥٤-٢٥٥.

١٨١- کەریمی حیسامی: کۆماری دیموکراتی کوردستان یان خودموختاری. چاپی

دووەم. سوید ١٩٨٦، ل١٥-١٦-١٧.

١٨٢- جەمال نەبەز: كوردستان و شۆڕشەكەی. ل١٢٠-١٢١.

١٨٣- نەوشیروان مستەفا ئەمین: حكوومەتی كوردستان. نوتریخت-هۆڵەندە. ١٩٩٣، ل١٤٤.

١٨٤- توفیق السویدی: مذكراتي. بیروت، ص٢٠٨-٢٠٩ بڕوانە: مستەفا ئەمین: حكوومەتی كوردستان، ل١٤٧.

١٨٥- م. س. لازەریف: كورد و كوردستان/ سەرچاوەی ناوبراو ل٥٧.

١٨٦- ت. ف. ئەریستۆفا: كەلتووری ماتریالی كورد لە سەدەی نۆزدەو نیوەی یەكەمی سەدەی بیست-دا. مۆسكۆ ١٩٩٠، ل١١ بەزمانی ڕووسی.

١٨٧- عەبدلرەحمان قاسملۆ: چل ساڵ خەبات... ل١٢٠.

١٨٨- گەسرەتیان م. ئە. : كوردەكانی توركیا... ل١٩٨ بەزمانی ڕووسی.

١٨٩- الدكتور عبدالرحمن قاسملو: كردستان والاكراد. ل٥٦.

١٩٠- دەقی ڕێككەوتننامەی دۆستایەتی لە نێوان ئێران و عێراقدا لە ١٨/٧/١٩٣٧دا بڕوانە: ش. ئە. نیازماتەف: ناكۆكی نێوان ئێران و عێراق. مۆسكۆ ١٩٨٩، ل١٥٨ بەزمانی ڕووسی.

١٩١- الدكتور عبدالرحمن قاسملو: كردستان و الاكراد. ل٧٢.

١٩٢- بۆ دەقی پرۆتۆكۆلەكە بڕوانە: جەمال نەبەز: ئێستەو پاشەڕۆژی نەتەوەی كورد لەبەر ئاگری جەنگی ئێران و عێراق-دا. ستۆكهۆڵم ١٩٨٩، ل١٧٩-١٨١.

١٩٣- جەمال نەبەز: بیری نەتەوەیی كوردی نەبیری (قەومیەت)ی ڕۆژهەڵاتی و نەبیری ناسیۆنالیزمی ڕۆژئاواییە. ستۆكهۆڵم ١٩٨٤، ١٤١.

١٩٤- ك. حیسامی: داخوا ئەوە (ژینوسید)نییە؟!/ ر. سەردەمی نوێ. ژ٢٢. ستۆكهۆڵم، سێپتێمبەری ١٩٨٨، ل١-٢.

١٩٥- بولتن خبري كردستان. شمارة ٢٥٨، سبتامبر ١٩٩١، حزب دمكرات كردستان ايران. نمايندگي خارج ازكشور صفحة ٥.

١٩٦- پرۆفیسور ڕادۆڤان باڤیچ: جووڵانەوەی ڕزگاریخوازانەی كورد لە خەباتیدا بۆ سەربەخۆیی نەتەوایەتی و سیاسی. مەحمود ملا عزت كردوویە بە كوردی/ سوید ١٩٨٥، ل٥٢.

١٩٧- دراسات كرديه: باريس. العدد ٢-٧، ١٩٩٢، ل٨٥.

١٩٨- بەربانگ: ژمارە ٧١-٧٢، ستۆكهۆلم، ١٩٩١ ل٨٦.

١٩٩- ایران: نقض حقوق بشر ١٩٨٧-١٩٩٠ سازمان عفو بين الملل. شماره: /MED 13/21/90

٢٠٠- راپۆرتی ئەمنیستی ئنتەرناشناڵ ژمارە: MED/ 13/ 10/ 90 January 1992

٢٠١- گۆڤاری سیاسەتی دەولی. ژمارە ٤، هەولێر ١٩٩٣، ل١٠٤.

٢٠٢- کوردستان: ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران. ژمارە ٢٠٠، نووتی ١٩٩٣، ل١٠-١١.

٢٠٣- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە ٢٥٢، هەولێر، ١٩٩٢/١١/٢٦، ل٢.

٢٠٤- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ. ژمارە ٢٤٨، هەولێر، ١٩٩٢، ل٢.

٢٠٥- کوردستان: ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران. ژمارە ٢١٢ سپتامبری ١٩٩٤، ل١٠-١١.

٢٠٦- کەسرەتیان: کوردەکانی تورکیا...ل١٧٤-١٧٥.

٢٠٧- م. س. لازەریف: کورد و کوردستان/ سەرچاوەی ناوبراو. ل٥٦.

٢٠٨- ڕێناس: دامەزراندنی دەوڵەتی سوری و کێشەی کورد لە سوریا. وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: خانی شەرەفکەندی/ گ. هیوا، پاریس ژمارە ٧، ١٩٩٠، ل٨٢.

٢٠٩- جەمال نەبەز: کوردستان و شۆڕشەکەی. ل١٣٦.

٢١٠- الدکتور عبدالرحمن قاسملو: کردستان والاکراد. ل٧٧.

٢١١- دیدار: گەلی کورد لە کوردستانی سوریاو چارەنووسێکی نادیار/ ڕ. سەردەمی نوێ. ستۆکهۆڵم. ژمارە ٤٥، نۆڤەمبەری ١٩٨٩، ل١-١١.

٢١٢- محمد طلب هلال: دراسة عن محافظة الجزيرة من النواحي القومية، الاجتماعية، السياسية. سورية- الحسكة ١٩٦٣، ص ٤-٥.

٢١٣- کرمانج گوندی: کوردستانی بندەستی سوریا/ ڕ. سەردەمی نوێ، ستۆکهۆڵم، سیپتێمبەری ١٩٩٠، ژمارە ٥٤، ل٨.

٢١٤- المثقف التقدمي: مجلة الحزب الديمقراطي التقدمي الكردي في سورية ١٩٨٩، العدد ٧، ص١٨-١٩.

215- David McDowall. The Kurds. London, 1989. P. P. 25-26

٢١٦- كرمانج گوندى: كوردستانى بندەستى سوريا/ سەردەمى نوێ. ژمارە ٤٥، ل٨.
٢١٧- ش. ج. اشريان: الحركة الوطنية الديمقراطية في كردستان العراق ١٩٦١-١٩٦٨، عربه عن الروسية: ولاتو. بيروت ١٩٨٧، ص١٠٦.
٢١٨- محمد طلب هلال: دراسة عن محافظة الجزيرة. ص٤٦.
٢١٩-محمد طلب هلال: هـ. س، ص٢
٢٢٠- محمد طلب هلال: هـ. س، ص٥
٢٢١- محمد طلب هلال: هـ. س، ص٢٤
٢٢٢- محمد طلب هلال: هـ. س، ص٢٤
٢٢٣- محمد طلب هلال: هـ. س، ص٢٦
٢٢٤- محمد طلب هلال: هـ. س، ص٤١
٢٢٥- محمد طلب هلال: هـ. س، ص٤١
٢٢٦- محمد طلب هلال: هـ. س، ص٤١
٢٢٧- محمد طلب هلال: هـ. س، ص٤٢
٢٢٨- محمد طلب هلال: هـ. س، ص٤٦-٤٨
٢٢٩- المثقف التقدمي. العدد ١٩٨٩،٧ ،ص٢٤.
٢٣٠- كرمانج گوندى: كوردستانى بندەستى سوريا/ ڕ. سەردەمى نوێ ژمارە ٨، ١٩٩٠، ل٨.
٢٣١- منذر الموصلي: عرب واكراد-رؤية عربية للقضية الكردية. بيروت ١٩٨٦، ص٢٢٣.
٢٣٢- منذر الموصلي: عرب واكراد. ص٣١١.
٢٣٣- منذر الموصلي: الحياة السياسة والحزبية في كردستان. لندن ١٩٩١.
٢٣٤- ڕەشاد ميران: هەڵسەنگاندنى ڕوانينێكى عەرەبى بۆ كێشەى كورد/ گۆڤارى ڕابوون. ژمارە ١، ستۆكهۆڵم ١٩٩١، ل٢٤.
٢٣٥- المنظمة العربية لحقوق الانسان. نشرة اخبارية. القاهرة. كانون الثاني ١٩٩٢، العدد ٤٩ ،ص١٠.
٢٣٦- گۆڤارى سياسەتى دەولى. هەولێر، ١٩٩٣، ژمارە ٤، ل٧٧-١٠٤.

٢٢٧- كوردستان: ئۆرگانی كۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموكراتی ئێران. ژمارە ٢٠٠، ئووتی ١٩٩٣، ل١٠.

٢٢٨- خەبات. هەولێر: ژمارەی ڕۆژی ١٤/٢/١٩٩٣، ل١.

٢٣٩- ٢٤٠-كەمال میراودەلی: دوازدە نەفرەتی كۆلۆنیالیزم لە كوردستاندا/ گۆڤاری ڕابوون، ستۆكهۆلم ١٩٩١، ژمارە ٢، ل٢٠-٢١

# مافی گەلی کورد

## لە داکۆکیی نێونەتەوەیی لە دژی جینۆساید

بەگوێرەی ئەو فاکتانەی لە بەشی دووەمدا پێشکەشمان کرد، بەڕاشکاوی دەڵێین، وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان (عێراق، ئێران، تورکیاو سوریا) تاوانی جینۆساید لەدژی گەلی کورد ئەنجام دەدەن. کەواتە گەلی کورد جێگەی جێبەجێ کردنی تاوانەکەیە، بۆیە دەبێتە بابەتی تاوانی نێونەتەوەیی. لێرەشدا پێویستە پێگەکانی (عناصر-ارکان) تاوان بخەینە ڕوو:

١- بابەتی تاوان: بابەتی تاوانی جینۆساید بەندە بەپەیوەندی نێوان وڵاتان لەداکۆکیکردنی هەر گروپێکی نەتەوەیی، ئێتنیکی، ڕەگەزی یان ئاینی. بەتایبەتیش بەربەندکردنی فەوتاندنی سەراپاگیری، کە بریتییە لەچەند جۆرێک: قڕکردنی بەدەنی، فەوتاندنی نەتەوەیی، کەلتووری و ئابووری. جۆری بابەتی تاوانی جینۆسایدیش، بەگوێرەی خەسڵەت و مەبەستی ئەنجامدانی کارەکە دیاری دەکرێت. بۆیە ئەنجامدانی مەبەستیش یا فەوتاندن بەئامرازی جیاجیاو هەمەجۆر ڕەنگە وەکو تاوانی سەختی جۆربەجۆر دیاری بکرێت.

جێگەی تاوانی جینۆساید (تاوان لێکراو)، بریتییە لە گەل، یا هەر گروپێکی مرۆیی یا کەرەستە و پێویستییە گرنگەکانی ژیان و بوونی ئەو گەلە یا ئەو گروپە مرۆڤە، وەکو وێرانکردنی شار، دێهات، سەرچاوەکانی ژیان.. هتد.

٢- سوبییێکتی (تاوانکار)ی تاوانی جینۆساید بریتییە لە کەسانی فەرمانبەر یا کەسانی ئاسایی کە سیاسەتێک یا فەرمانێکی دیاریکراو جێبەجێ دەکەن بەمەبەستی فەوتاندنی بابەتی تاوانەکە. سوبییێکتی تایبەتی تاوانی

جینۆساید، بەگوێرەی پایەو مەقامی کۆمەڵایەتی سوبێیکتەکە دیاری دەکرێت، ڕەنگە حکوومەتی یا کەسانی ئاسایی یا ڕێکخراوێکی تیرۆری جیهانی بێت.

٢- لایەنی بابەتیی (الجانب الموضوعی) تاوانی جینۆساید، بەم جۆرە دیاری دەکرێ:

یەکەم: پێشنیازی تاوانکار لە ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراوی دژ بەیاسا جا تاوانکار (حکوومەت بێت یان کەسانی ئاسایی).

دووەم: هۆکاری ڕەفتاری دژ بە یاسا.

**لایەنی بابەتیی جینۆساید ئەم کارانە دەگرێتەوە:**

یەکەم: جێبەجێ کردنی کاری تاوان، واتە کردن (القیام بالفعل) یا نەکردن (الامتناع عن الفعل) کە ببێتە هۆی ئەنجامدانی جینۆساید.

دووەم: ئەنجامی تاوانکاری (عواقب اجرامیە)، کە ببێتە هۆی تەواوکردنی تاوانی جینۆساید، وەکو ئەو کارانەی کە یاسای نێودەوڵەتان پێشێل دەکەن و ئاشتی دەشێوێنن.

سێیەم: پەیوەندی هۆکارانە لەنێوان کار و ئەنجامدا.

چوارەم: شوێن، کات، بارودۆخ، شێوەو ئامرازی ئەنجامدانی جینۆساید، ئەوانەش پێوەند نین بە سەردەمێکی دیاریکراوەوە، چونکە جینۆساید لە سەردەمی شەڕو ئاشتیشدا ئەنجام دەدرێ، بەڵام لە شوێنێکی دیاریکراودا، شارێک یا وڵاتێک یا ناوچەیەکی دیاریکراو.

جینۆساید، هۆی پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی دژ بەمرۆڤە دەرهەق بەگەلێک یا کۆمەڵێک بە بەکارهێنانی شێوەو ئامرازی جیاجیا، چەکی قڕکردن، چەکی وێرانکردن، سوپا یا ئامرازی تر کە هەموویان بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتان پێشێل دەکەن.

دەبینین گەلی کورد بووە بەجێگە مەبەستی تاوانی جینۆساید، چونکە

سیاسەتی وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان بریتییە لە: بەکۆمەڵ قڕکردنی بەدەنی، فەوتاندنی نەتەوەیی، کەلتووری و ئابووری. جگە لەوەش تاوانی (ئیکۆساید) واتە وێرانکردنی ئیکۆلۆژیا – ئەنجام دەدرێ. بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی، بەکارهێنانی ئامراز و کەرەستەی ژەهراوی، وێرانکردنی ژینگە، ئەمانە دەبنە هۆی سەرجەم قەڵاچۆکردن، واتە قڕکردنێکی سەراپاگیری. ژینگە دەلەوتێندرێ، ئیتر ژیانی خەڵکی سەخت و زەحمەت دەبێ و ئەنجامی دوور و خراپی دەبێت لەسەر ژیان و بوون.

کەواتە ئەنجامدانی جینۆساید، واتە پێشێلکردنی یاسای نێودەوڵەتان، ئەو پێشێلکردنەش دەبێتە هۆی لێپرسینەوەی (بەرپرسیارێتی) سوبێکتی تاوانەکە. ئیتر بەگوێرەی بەڵگەنامە یاساییەکانی نێودەوڵەتان، وڵاتی یاسا پێشێلکەر لە لێپرسینەوەی نێونەتەوەیی قوتار نابێت. بەڵام میکانیزمی داسەپاندنی ئەو لێپرسینەوەیە (بەداخەوە) هەتا ئێستاش پەیوەندی بە سیاسەت و بەرژەوەندی وڵاتانی جیهانەوە هەیە. بەبیروڕای پرۆفیسۆر ڤ. ئە. ڤاسیلێنکە (لێپرسینەوەی یاسای نێونەتەوەیی هەمیشە بەهۆی ئەرکی هەمەجۆرەی سوبێکتی یاسا پێشێلکەرەوە دیاری دەکرێ، کە ئەویش بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندە بەچۆنێتی سەرپێچیکردنی یاساوە، بەتایبەتی وەکو بیناکردنەوە RESTORATION، ڕازی کردن، دابینکردن -SATISFAC TION، لە جێگەدانان (بدیل) SUBSTITUTE، قەرەبووکردنەوە -REPARTA TION، سنووردارکردنی سەروەری (سیادە) و کەسایەتی یاسایی نێونەتەوەیی وڵاتی تاوان ئەنجامدەر[1]، بەڵام ئەگەر لێپرسینەوەکە بەهۆی فەوتاندنی مرۆڤەوە بێت، ئەوا تەنها بە داوەری کردنی تاوانکار چارەسەر دەکرێت.

جۆرەکانی لێپرسینەوەش بەگوێرەی ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتان و مەرجە بابەتییەکانی ڕەفتاری دەوڵەت و کارەکانیدا هەیە، دیاری دەکرێت. لە هەر بوارێکی پەیوەندی کۆمەڵایەتیدا بێت، بەتایبەتیش نێونەتەوەیی، ئەو پەیوەندییە ڕەنگە دوو لایەنی هەبێت:

١- پۆزەتیف.

٢- نێگەتیف.

١- پۆزەتیف: لەکاتێکدا ئەگەر ڕەفتاری سوبیێکت گونجاو بێت لەگەڵ بنەما سەپێنراوەکاندا (بنەما ئیمپێراتیفەکاندا).

٢- نێگەتیف: لە کاتێکدا سوبیێکت بنەما سەپێنراوەکان پێشێل دەکات.

بەرپرسیاریتی پۆزەتیفانە: واتە کۆنترۆڵ کردنێکی بەردەوامی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە لەلایەن سوبێیکتەوە، بەسەر ڕەفتاری خۆیدا، لەگەڵ چاودێریکردنی بنەما باڵاکان و پێویستییەکانی ژیاندا.

بەرپرسیاریتی نێگەتیفانەش: واتە ئەرکی سوبیێکت بە لە ئەستۆگرتنی قورسایی لە ئەنجامی پێشێلکردنی بنەما کۆمەڵایەتییە باڵاکانەوە.

کەواتە ئەگەر هەردوو جۆری بەرپرسیاریتی (پۆزەتیف و نێگەتیف)، دیاردەی یاسایین هەر وەکو چۆن تایبەتن بە بواری ڕێکخستنی یاسایی ناوخۆی وڵات بە هەمان شێوەش بەبواری نێونەتەوەییەوە[٢].

لەبارەی بەرپرسیاریتی پۆزەتیفانە، بەندی ٢٤ی دەستوری UN ئەوە دیاری دەکات کە: (وڵاتە ئەندامەکانی UN بەرپرسیاریتییەکی گرنگ دەخەنە ئەستۆی ئەنجومەنی ئاسایش بۆ پشتگیریکردنی ئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەیی و ڕازین بەوەی لە بەجێهێنانی ئەو ئەرکانەی کە بەهۆی ئەو بەرپرسیاریتییەوە دروست دەبێت، ئەنجومەنی ئاسایش بەناوی ئەوانەوە لەکاردا بێت)[٣]. هەمان کات بەندی شەشەمی دەستوری ڕ.ن.ی UN لەدەرکردنی ئەو وڵاتانە دەدوێ کە بەشێوەیەکی سیستێماتیک پرنسیپەکانی UN پێشێل دەکەن: (ئەگەر ئەندامی UN بەشێوەیەکی سیستێماتیک پرنسیپەکانی دەستوری پێشێل کرد، کۆمەڵەی گشتی دەتوانێت لەسەر ڕاسپاردەی ئەنجومەنی ئاسایش دەری بکات)[٤].

کۆمەڵەی گشتی ڕ.ن.ی لە بڕیارنامەی ٥٤٥ VI / لە ١٩٥٢/٢/٥دا بڕیار دەدات کە: (بەندێک بۆ جێگیرکردنی ئەو پرنسیپەی وا لە دەستوری ڕ.ن.ی

دا دیاری کـراوە، لە چوارچێـوەی پەیمانێکی نێـونەتەوەیی یا پەیمانەکـانی نێـونەتەوەیی لەبارەی مافی مرۆڤـەوە جێگیـر بکات)[٥]. هەروەها کۆمـەڵەی گـشـتی لەبارەی هەمـان بەندەوە بڕیاری داوە کـە: (هـەمـوو گـەلان مـافی بڕیاردانی چارەنووسیـان هەیە، پێویستە هەموو وڵاتان بەو وڵاتانەشـەوە کە بەرپرسیـارێتی ئەو هەرێمانەی بەڕێوە نابردرێن، دەکەوێتە ئەستۆیان، دەبێ بەگـوێرەی مـەبەست و پرنسـیـپەکـانی UN توانای خـۆیان بخـەنە کـار بۆ بەجێگەیاندنی ئەو مافە بۆ گەلانی ئەو هەرێمانە)[٦]. بەندی ٧٣ی دەستوری UN جـەخت لەسـەر هەمـان پرنسـیپ دەکـات و وڵاتان پابەند دەکـات بەدەستپێکردنی پەرەپێدان و دابینکردنی ژیانی خۆشگوزەرانی هەتا لەتوانادا بێت لە چوارچێـوەی ئاشـتی و ئاسـایشی نێـونەتەوەییـدا، تا گـەلانی ئەو هەرێمانە لە بواری سیاسی و ئابووری و زانستی و کۆمەڵایەتیدا پێش بکەون. بۆ ئەو مـەبەسـتـەش دەبێ وڵاتان بەویژدانەوە پارێزگـاری لە گـەلانی ئەو هەرێمانە بکەن و ڕێز لە خـواستی سیاسییـان بگرن. بەگوێرەی ئەم بەندانە، وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان لەسەریانە داکۆکی لە گەلی کورد بکەن و ڕێگەی بۆ خـۆش بکەن کـە مـافی خـۆی بەکـاربهـێنێت لە دیاریکردنی چارەنووسـیدا، هەڵوێستی پێچـەوانەی ئەو بەندانەش، وەکـو لە سیـاسـەت و پراکـتـیکی ئەو وڵاتانەدا دەردەکـەوێ، بەرپرسـیـارێتی نێگەتیـڤـانە (سلبی) دروست دەکـات. چونکە ئەو وڵاتانە خـۆیان نەک هـەر خـۆیان لە قـەرەی مەبەستی ئەو بەندانە و بنەماو پرنسیپەکانی یاسـای نێودەوڵەتان نادەن لە ڕێزگرتنی مافی گەلی کورددا، کە هەموو ئەندامانی UN لەسەریانە پێوەی پابەند بن، بەڵکو سیاسـەتی وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان، پێشێلکردنی ئەو پەیمانەیە کـە خۆیانی پابەند کـردووەو پێوەی پەیوەست نابن. کـەواتە لە ئەنجامی دەست بەکـار نەکـردنی لەبار و لەبەر ڕەفتـاری دژ بەیاسـا لەلایەن وڵاتە داگیرکـەرەکانەوە کـە دەبێتـە هۆی شـکاندنی پابەندێتی نێـونەتەوەیی، مەسەلەی بەرپرسیارێتی لە پەیوەندی یاسایی لە یاسای نێودەوڵەتاندا سـەر هەڵدەدات[٧]. بۆیە بەڕاشکاوی دەتوانین بڵـێین، بەرپرسـیـارێتی وڵاتە

داگیرکەرەکانی کوردستان دوو لایەنەیە:

١- لە لایەکەوە: شکاندنی ئەو پابەندێتییە نێونەتەوەیییەی کە لە ئەستۆیانە واتە دەست بەکار نەکردن (الامتناع عن الفعل).

٢- لەلایەکی ترەوە: پراکتیک کردنی جینۆساید لەدژی گەلی کورد، ئەمەیان ڕەفتاری نادروست و کاری دژ بە یاسای نێودەوڵەتانە (القیام بالفعل).

یاساناسی سویسری، ی. بلیونچلی دەڵێ: (ئەگەر پێشێلکردنی یاسای نێودەوڵەتان وەکو مەترسییەک هەڕەشەی لە ئاسایشی گشتی کرد، ئەوا نەک وڵاتی تاوان لێکراو، بەڵکو هەموو ئەو لایەنانەی هێزی بەکاریان هەیە لەداکۆکیکردنی یاسای نێودەوڵەتاندا، دەبێ دژ بەو کارە بن و گرنگی بەدابینکردنەوەو سەقامگیرکردنەوەی سیستێمی یاسایی بدەن)[٨].

بەڕای ئێمە، نەک تەنیا وڵاتی تاوان لێکراو، بەڵکو هەر گەلێکی تاوان لێکراویش، لە کاتی نەبوونی دەوڵەتدا، ئەگەر بەر هەڕەشەی فەوتاندن بکەوێ، ئەوا نەک هەر ئاسایشی گشتی دەشێوێ، بەڵکو دەبێتە کارەسات بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی. بۆیە چ ئەو گەلەی کە تاوانی لێ کراوە، چ گەلان و وڵاتانی تر، دەبێ دەست بەکار بن لەدژی تاوانکار.

بەم جۆرە، پێویستی داسەپاندنی مەسەلەی بەرپرسیاریتی سوبێکتی تاوانی جینۆساید لە یاسای نێودەوڵەتاندا دەبێتە ئەرکێکی گرنگ و حەتمی. لێرەشدا پێویستە ئەوە ڕوون بکەینەوە کە لە کوردستانی بندەستی تورکیاو عێراقدا، جگە لە پراکتیک کردنی جینۆساید، هاوکات تاوانی ئێکۆساید Ec-ocide و بیۆساید Biocide ئەنجام دەدرێ (فەوتاندنی ژینگەو کوشتنی ژیان). ئێکۆساید، هەندێ جار ئەنجامی وا دروست دەکات کە بۆ ژینگەی مرۆڤ و بوونی تەواو ترسناکە، ڕەنگە جارێکی تر ژیان دووبارە نەبێتەوە لەو ژینگەیە، یا ژیانێکی شێواو و ئاڵۆز هەبێت. مەترسی ئێکۆساید لەوەدایە، تێکدانی هاوکێشەی ئێکۆلۆژیا لەهەر هەرێمێکدا بێت، زۆر بەخراپیش کار دەکاتە سەر هەرێمەکانی تر.[٩]

بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و کەرەسەی ژەهراوی، بەکارهێنانی بۆمبای هێشوویی و ناپاڵمی فسفۆری لەدژی گەلی کورد، دەبنە هۆی کوشتنی ژیان بەگشتی لەو هەرێمانەی کە بوونەتە مەیدانی جەنگ و تاقیکردنەوەی چەک و تەقەمەنی. سەرباری ئەوە وێرانکردن و تێکدانی سروشت و باخ و بێستان و سەرچاوەکانی ژیان، کارگەلێکن دەبنە هۆی (گۆڕانی ترسناک کە سیستێمی ئاسایی هاوکێشەی ژینگە تێک دەدەن، ئەوەش زۆر سەخت دەبێت بۆ مرۆڤ کە دۆخەکە بگەڕێنێتەوە باری ئاسایی جارانی، ئەو تێکدانەی هاوکێشەی ژینگە لە ئەنجامدا دەبێتە پەککخستنی ژیان لەسەر زەوی)[١٠]. لە سەرجەمی ئەو ناوچانە و دەوروبەرەدا، ژەهراوی بوونی ئاو و هەواو ڕووەک و خواردەمەنی، ئەمانەش جگە لەوەی دەبنە هۆی کوشتنی مرۆڤ و هەموو زیندەوەرێک، دەبنە هۆی ئەوەش کە نەخۆشی و پاشماوەی خراپ لەلای مرۆڤ دروست دەکەن، بۆیە ئەنجام لەو نەوەیەوە دەمێنێتەوە بۆ وەچەی پاشەڕۆژ. ئاو و هەوا سەرچاوەی سەرەکی بەردەوامبوونی ژیان و گوزەرانی مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەکیشن، پیس بوونیان یا ژەهراوی کردنیان، دەبێتە هۆی گەلێ نەخۆشی خراپ، وەکو کۆلێرا، تیفۆئید ((TYPHOID FEVER، پاراتیفۆئید (PARATYPHOID)، دیزانتری (DYSENTRERY)، تولاریمیا (TULAREMIA)، ئاوسانی جگەر (INFECTION HEPATITS)[11]. هەروەها گەلێ نەخۆشی تر کە لە مرۆڤدا دەمێنێتەوەو لە کاتی زاووزێدا دەگوێزرێتەوە بۆ منداڵ. وێرانکردنی خانووبەرەو باخ و دارستان لە ناوچەکاندا بەجۆرێکی تر کار دەکەنە سەر ژیانی مرۆڤ و ئاژەڵیش، کە هەڵتەکاندنی ستروکتوری هەمەلایەنی ژیانەو مرۆڤ پەک دەخات و گەڕانەوەی زەحمەتتر دەبێت، کەواتە بە ئەنجامدانی ئیکۆساید (وێرانکردن و لەوتاندنی ژینگە)، تاوانی بیۆساید واتە (فەوتاندنی ژیان) دێتە ئەنجام، کە هەر بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی و ژەهراوی ئەنجامی بایۆلۆژی خراپی هەیە لەسەر ژیان. ئیتر وێرانکردنی سەراپاگیری ژینگەو سروشتی دەوروبەری مرۆڤ، جگە لەوەی پەیوەندە بە پێشێلکردنی ئاسایشی نێونەتەوەیی، زەبر و زیان گەیاندنیشە

بەخۆشگوزەرانی و تەندروستی نەک تەنها نەوەی سەردەم، بەڵکو وەچەی داهاتووی مرۆڤیش[١٢].

هەر بەهۆی کێشەی ئیکۆسایدەوە، ١٩٧٧/٥/١٨ لەدوای بڕیار لەسەردانی کۆمەڵەی گشتی UN، پەیماننامەیەکی جیهانی تەرخان کرا بەقەدەغەکردنی کەرەسەو ئامرازی جەنگی یا زیان بەخش کە کار دەکەنە سەر ژینگە[١٣]. خاڵی یەکەمی بەندی یەکەمی ئەو پەیماننامەیە دەڵێ: (هەموو وڵاتانی بەشداری ئەم پەیماننامەیە دەبێ پەنا نەبەنە بەر بەکارهێنانی ئامرازی جەنگ یا هەر ئامرازێکی زیان بەخش بەژینگە، کە ئەنجامی سەخت یا درێژخایانی هەیە، ئەویش وەکو ئامرازی وێرانکردن کە زیان و خەسارەتی هەیە بۆ وڵاتێکی تر). بەگوێرەی بەندی دووەمیش: (ئەو ئامرازانەی کە کار لە ژینگە دەکەن، هەر ئامرازێکی گۆڕانکاری بن، بە مەبەستی دەست بەسەراگرتنی پرۆسەی سروشت، قەدەغەن وەکو گۆڕینی دینامیکی، ستروکتور یا پێکهاتەکانی زەوی وەکو: ژینگە، چینە بەردییەکان(LITHOSPHERE) الغلاف الصخري) ، (HYDROSPHERE) (الغلاف المائي)، (ATMOSPHERE) (الغلاف الجوي) یان والآیی ئاسمان(الفضاء الجوي)[١٤].

ئاشکراشە کە چ لە جینۆساید یاهەر تاوانێکی دیکەی نێونەتەوەییدا سوبێیکتی تاوان (تاوانکار) بەرپرسیارێتی نێونەتەوەیی دەکەوێتە ئەستۆ، بەتایبەتیش ئەنجومەنی ئاسایشی UN مافی تەواوی هەیە کە بڕیاری داسەپێنەر و مەرجدار بۆ هەموو وڵاتانی ئەندامی UN بدات. ئەو بڕیارانەش دەکرێ گەلەکی و داسەپێنەر بن[١٥].

خاڵی یەکەمی بەندی ٢٤ی دەستوری UN، وەکو پێشتر ڕوونمان کردەوە، بۆ بەپەلەو کاریگەرانە بەجێ گەیاندنی کاری ڕ. ن. ی ئەنجومەنی ئاسایش لە بری ئەندامانی بەرپرسیارێتی گرنگ دەکەوێتە ئەستۆی بۆ دابینکردنی ئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەیی[١٦].

بەگوێرەی بەندی ٢٥یش، ئەندامانی ڕ. ن. ی، (بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش ڕێز لێ دەگرن و جێبەجێی دەکەن)[١٧]. پەیماننامەی ١٩٤٨ دەربارەی

قەدەغەکردنی تاوانی جینۆساید و سزا خستنە سەر تاوانکارانی، جینۆسایدی وەکو تاوانێکی سەربەخۆی نێونەتەوەیی دیاری کردووەو جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە:

یەکەم: ئەم تاوانە تەواو ترسناکەو هەڕەشە لە بوونی مرۆڤ دەکات، نەک تەنیا بەهۆی جەنگەوە، بەڵکو بەبێ جەنگیش لە سەردەمی ئاشتیدا، ئەنجام دەدرێ.

دووەم: لەم سەردەمەدا بەبێ جەنگیش لە ئارادایە[١٨].

ئەمەش ڕاستەوخۆ باری سەختی گەلی کورد دەگرێتەوە، لە عێراق و ئێران و تورکیا، جەنگێکی بەردەوامی لەدژ دەکرێ و باری گەلی کورد لە سوریا کە جەنگی تیادا نییە، بەڵام پرۆسەی فەوتاندنی نەتەوەیی گەلی کورد بەردەوامە، بەڕاستیش ستروکتوری ژیانی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی خەڵکی کوردستان تێکدراوەو شێواوە. ئەو ڕاستییەش لە بەندی یەکەمی پەیماننامەی ١٩٤٨دا جێگیر کراوە، کە (جینۆساید، پەیوەند نییە بەوەی کە لەکاتی جەنگدا یا لە سەردەمی ئاشتیدا ئەنجام دەدرێ، بەڵکو تاوانێکە بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتان پێشێل دەکات و لەدژی تاوانکارانیشی بەربەندی دادەنرێ و سزا دەدرێن)[١٩].

مەسەلەی بەربەندکردنی جینۆسایدی گەلی کورد بەهۆی سیاسەتی وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە تاکو ئێستا چارەسەر نەکراوە. ئەو وڵاتانە وای دەردەخەن کە مەسەلەی کورد کێشەیەکی ناوخۆیە و ڕێگە نادەن لە دەرەوەڕا چارەسەری بۆ دابنرێ. بەڵام بەگوێرەی یاسای نێودەوڵەتان(پێشێلکردنی فراوان و سەختی مافی مرۆڤ، ئەپارتیید، جینۆساید، جیاوازی ڕەگەز و بێ بەشکردنی سەرجەمی گەل لە مافی دیاریکردنی چارەنووس، ئەمانە تاوانی نێونەتەوەیین، بەڕاستی ناکرێ لە چوارچێوەی یاسای ناوخۆی هەر وڵاتێکدا گەمارۆ بدرێن)[٢٠]. لەم بارەدا مەبەست لە چارەنووسی گەلی کورد و جینۆسایدە، چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، تەنیا لە چوارچێوەی یاسای نێودەوڵەتاندا دەکرێ، چونکە بەڕاستی (هیچ وڵاتێک ناتوانێ پشت بەحوکمی

یاسای ناوخۆی ببەستێ، بۆ ئەوەی بەجێ نەگەیاندنی ئەرکە نێونەتەوەییەکان بەڕاستی بسەلمێنێ)[٢١]. لەبارەی هەمان ڕاستییەوە، بەندی ٢٦ی پەیماننامەی ڤیەننا دەربارەی ڕێکەوتننامەی نێونەتەوەیی لە ١٩٦٩/٥/٢٤دا پێی لەسەر دادەگرێ. وەکو تر دەبێ بڵێین، مەسەلەی هاوئاهەنگی و یەکانگیری بنەماکانی یاسای ناوخۆی دەوڵەت و یاسای نێودەوڵەتان دێتە پێشەوەو دەبێ ڕەچاو بکرێ. وەکو لەو بارەیەوە پرۆفیسۆر ف. گ. بوتیکتێڤیچ دەڵێ: (پێویستە میکانیزمی هاوئاهەنگی یاسای ناوخۆی دەوڵەت و یاسای نێودەوڵەتان لەگەڵ میکانیزمی کۆنترۆڵکردنی یەکانگیری بنەماکانی هەردوو سیستێمی یاسایی یەکتری تەواو بکەن)[٢٢].

وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان دان بەوەدا نانێن کەکورد گەلێکی سەربەخۆیەو خاوەنی خاک و مێژووی خۆیەتی و مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆی هەیە. دەستوری تورکیا و ئێران و سوریا بەهیچ جۆرێک باس لە بوونی کورد ناکەن. ئەگەرچی بەندی پێنجەمی دەستوری کاتیی عێراق ١٩٧٠دان بەوەدا دەنێ کە گەلی عێراق لەدوو نەتەوە پێک دێت عەرەب و کورد: (ب- يتألف الشعب العراقي من قوميتين رئيسيتين، العربية والكردية، ويؤكد هذا الدستور علي الحقوق القومية للشعب الكردي، وعلي حقوق جميع الاقليات ضمن الوحدة العراقية) واتە: (گەلی عیراق لەدوو نەتەوەی سەرەکی پێک دێ، عەرەب و کورد. ئەم دەستورەش مافی نەتەوایەتی گەلی کورد دیاری دەکات و مافی هەموو کەمە نەتەوایەتییەکانی تریش لە چوارچێوەی یەکێتی عێراقدا دیاری دەکات). دیارە ئەم بەندە ڕوونە لەدان پێدانانی گەلی کورد لە عێراق، بەڵام لەدونیادا هیچ گەلێک بەبێ خاک بوونی نییە، ئەگەر دان بەوەدا نەنرێ ئەو خاکەی کە لەسەری دەژی نیشتمانیەتی. خاڵی(١) هەر لەبەندی پێنجەم دەڵێ: (العراق جزء من الامة العربية) واتە (عێراق بەشێکە لە میللەتی عەرەب)[٢٣]، کەواتە عێراق بە عەرەب و کورد و کەمایەتیەکانی تریشەوە بە سەرانسەری سنوورەکەیەوە بەشێکە لەمیللەتی عەرەب. لێرەدا مانای ئەوە دەبەخشێ، گەلی کورد بە نیشتمانەکەیەوە بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب. ئەمەش کێشەی

سەرەکی نێوان گەلی کورد و ڕژێمی دەسەڵاتدارە لە عێراقدا، چونکە عێراق خوارووی کوردستانی پێوە لکێندراوە، ئەو بەشەی کوردستانیش بەشێکی دابڕاوە لە بەشەکانی تر کە سەرانسەری لەنێوان عێراق و ئێران و تورکیا و سوریادا دابەش کراوە. بەم جۆرە گەلی کورد لە خوارووی کوردستان بەگوێرەی دەستوری عێراق بەشێکە لەو نەتەوەیە کە سەرانسەری سنووری سیاسی ئێستای عێراق بە بەشێک لەنەتەوەی عەرەب دەژمێردرێت. کەواتە لەڕووی تیۆرییەوە گەلی کورد لە خوارووی کوردستان تەعریب کراوە، هەر وەکو لە گەلێ بەڵگەنامەی تریشدا نەخشەی بۆ کێشراوەو لە پراکتیکیشدا تەواو پەیڕەو دەکرێ، بەتایبەتی لەم بارەیەوە لە ڕاپۆرتی سیاسی کۆنگرەی یانزەهەمی حیزبی بەعس لە عێراقدا دەربارەی بوونی نەتەوەی کورد دەڵێ: (...ان هذه القوميات التي تمتلك لغات وسمات متميزة عن اللغة والسمات العربية والتي تعيش في الوطن العربي منذ حقبة طويلة كالقومية الكردية قد ارتبطت بالامة العربية بوشائج عميقة الجذور فهي اصلا تعيش منذ نشأتها وعبر هذه الحقبة في الارض التي عرفت تاريخيا بالوطن العربي)[٢٤].

واتە: (... ئەو نەتەوانەی کە زمان و خەسڵەتیان جیاوازە لە زمان و خەسڵەتی عەرەبی هەر لە کۆنەوە لە نیشتمانی عەرەبدا دەژین، وەکو نەتەوەی کورد کە بەڕەگ و ڕیشەی قووڵ پەیوەندە بەمیللەتی عەرەبەوە، هەر لە بنەڕەتدا و لە بوونیەوە بەدرێژایی ئەو سەردەمەش لەو خاکەدا دەژی کە لە مێژوودا بەنیشتمانی عەرەب ناسراوە).

لێرەدا دەبێ ئاماژە بەو خاڵە گرنگە بکەین لەدوای جەنگی یەکەمەوە، کە سنووری نێوان ئەو وڵاتانە، بە لکاندنی بەشەکانی کوردستانەوە دیاری کرا، کورد، وەکو گەل و خاک دابەش بوو لەنێوانیاندا، بۆیە بەگوێرەی یاسای ناوخۆی ئەو وڵاتانە کوردی هەر بەشێک هاونیشتمانی ئەو وڵاتەیە کە پێوەی لکێنراوە. بەڵام گرنگی مەسەلەکە لەوەدایە، دەبێ کورد وەکو گەل حسابی بە یەکسانی بۆ بکرێ لەناوخۆی ئەو وڵاتانەدا. واتە چارەنووسی وا دیاری کرا وەکو مەسەلەیەکی ناوخۆی ئەو وڵاتانە پەیوەندی پێیانەوە هەیە. ئەو وڵاتانەش

لەسەریانە ڕێگە بەیەکسانی و پێشکەوتنی گەلی کورد لە ڕووی سیاسی، ڕۆشنبیری، ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە بدەن. لەکاتێکدا ئەو یەکسانییە لە پراکتیکدا ڕەفز دەکرێتەوە، مەسەلەیەکی هەرە گرنگ دێتە پێشەوە، کە تێڕوانینێکی تازەیە لە یاسای نێودەوڵەتاندا، ئەویش ئەوەیە، گەلی کورد لێرەدا مافی ئەوەی هەیە دووبارە چارەنووسی خۆی دیاری بکاتەوە. ئالێرەوە، تەنیا لە چوارچێوەی یاسای نێودەوڵەتاندا چارەسەر بۆ ئەو کێشەیە دەدۆزرێتەوە، نەک لە یاسای ناوخۆی ئەو وڵاتانەدا.

ئەو وڵاتانەش، بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکی خۆیان لەسەریانە یاساکانی ناوخۆیان یەک بخەن لەگەڵ یاسای نێودەوڵەتاندا و لە پراکتیکیشدا پەیڕەوی بکەن. لێرەدا ئەوەمان بیر نەچێت لە زۆر حاڵەتدا سیاسەت و بەرژەوەندی وڵاتانی دنیا دەبنە تەگەرە لە پەیڕەوکردن و جێبەجێ کردنی بنەما و پرنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتاندا.

دەبینین، گەلێ لە وڵاتانی دنیا لە دەستوری خۆیاندا کە لەپێش جەنگی دووەمیشدا دانراون، حوکمی پەیماننامە و ڕێکەوتننامەی نێونەتەوەیی لەبەرچاو دەگرن و یاساکانی ناوخۆیان هاوئاهەنگ دەکەن لەگەڵیاندا. دەستوری بەلجیکا لە بەندی ٦٨دا، سویسرا لە بەندی ١٣دا، لەم وڵاتانە ڕێکەوتننامەی نێونەتەوەیی وەکو بەشێک لە یاسای ناوخۆ دەژمێردرێ[٢٥]. دەستوری گەلێ وڵاتیش، بەگۆڕانکاری، یا دانراو لە دوای جەنگی دووەمەوە، پلەی سەرەکی و باڵادەستی دەدەن بە بنەماکانی ڕیکەوتننامەی نێونەتەوەیی بەسەر یاسای ناوخۆیاندا. بۆ نموونە: بەندی ٢٥ی یاسای بنەڕەتیی کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵی دەڵێ: (بنەما گشتییەکانی یاسای نێودەوڵەتان، بەشێکن لەیاسای فیدراڵی. ئەو بنەمایانە لە سەرووی یاساوەن (مەبەست لە یاسای ناوخۆیە) و ڕاستەوخۆ ماف و ئەرک دێننە ئاراوە بۆ دانیشتوانی سنووری فیدراڵ)[٢٦]. جارێ هەر نەبوونی حوکمی بنەما و پرنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتان، ئەوەی پەیوەندی بە ماف و ڕێزگرتنی گەلانەوە هەیە، لە یاسای ناوخۆی وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا، ڕاستەوخۆ ئەو وڵاتانە لەسەر

پێشێلکردنی مافی گەلی کورد ڕادەگرێ و لە پراکتیکیشدا هەتا ئێستا بەردەوامن، هەر بۆیەش ئەو پێشێلکردنە گەیشتە تاوانی جینۆساید، کە مەترسی نەک هەر لەسەر ئێستا، بەڵکو داهاتووی کوردیش دروست کردووە. دەکرێ بڵێین (تێ هەڵدان!)ێکی تەواوی پرنسیپ و بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتانە لەمەڕ ڕێزگرتنی مافی مرۆڤ. تاوانی جینۆساید وەک هەر تاوانێکی تری نێونەتەوەیی چوار پێگەی هەیە، بەگوێرەی ئەو چوار پێگەیەش یاسا پێشێلـکەر دیاری دەکرێ: مەبەستی تاوان، سەرپێچی کردنی یاسا، هۆ و زیان، پەیوەندی نێوان سەرپێچی کردنی یاساو زیان[٢٧]. بە حوکمی ئەو چوار پێگەیە، دەبینین وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان (عێراق، ئێران، تورکیا و سوریا)، پێشێلکەری یاسای نێونەتەوەیین. کۆمەڵگەی جیهانیش بۆی هەیە مەسەلەی بەرپرسیارێتی یاسایی نێونەتەوەیی، ئەو چوار وڵاتە لە چوارچێوەی UNدا بخاتە ڕوو. ئەنجامی سیاسەتی جینۆساید لەو وڵاتانەدا لایەنی(ماددی) تاوانەکەی ئاشکرا کرد، ئیتر ئەو تاوانە مەسەلەی کوردی تەواو گەیاندە یاسای نێودەوڵەتان. ئەگەرچی ئەو وڵاتانە خۆیان ئەندامن لە ڕ. ن. ی، بەڵام بەردەوامن لە شکاندنی پابەندێتی نێونەتەوەیی و پێشێلکردنی مافی گەلی کورد.

لە پێشەکی دەستوری UN دا پێویستی ئەوە دیاری کراوە (بۆ سازدانی بار و زرووفێکی لەبار بۆ دابینکردنی دادگۆیی (عدالة) و ڕێزگرتنی ئەو ئەرکانەی کە لە پەیماننامە و سەرچاوەکانی تری یاسای نێودەوڵەتانەوە دێنە ئاراوە و کار بکرێ بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی کۆمەڵایەتی و پێشخستنی ئاستی ژیان لە بار و زرووفێکی زیاتر ئازادیانەدا)[٢٨].

لەبەر ڕۆشنایی ئەم پرنسیپەدا، گەلی کورد دەبێ ئەو مافانەی خۆی بەجێ بگەیێنێ کە یەکسان بێ لەگەڵ گەلانی تردا، بەڵام لە ئەنجامی سیاسەتی ڕێگەگرتن و تەگەرە خستنەبەر لەلایەن وڵاتە داگیرکەرەکانەوە، ئەو مافە زەوت کراوە، ئەگەرچی (خەسڵەتی تایبەتی مافی مرۆڤ، ئەرکە لە ئەستۆی وڵاتاندا کە ڕێزی لێ بگرن، بەحوکمی ئەو ئەرکەش کە پێوەی پابەندن، هەر

خۆدزینەوەیەکیش لەو پابەندێتییە، بەرپرسیارێتی بۆ دەوڵەت دێنێتە ئاراوە)[٢٩].

کۆمەڵەی گشتی UN ١٩٤٦/١٩/١١ لە بڕیارێکدا ڕوونی کردووەتەوە کە وڵاتانی ئەندامی ڕ. ن. ی جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە ئەو پرنسیپانەی لە دەستووری دادگای سەربازی نێونەتەوەییدا (دادگای نۆرنبێرگ) و لە بڕیارەکانی دادگادا هاتوون، ئەوانە (پرنسیپی یاسای نێودەوڵەتانن)[٣٠].
بەندی دووەمی یاسای ژمارە ١٠ لە دادگای نۆرنبێرگ دەربارەی سزادانی کەسانی تاوانبار بەتاوانی جەنگ، تاوانی دژی ئاشتی و دژی مرۆڤایەتی، ئەم کارانەی خوارەوە بەتاوان دیاری دەکات:

١- تاوانی دژی ئاشتی

٢- تاوانەکانی جەنگ

٣- تاوانی دژی مرۆڤایەتی: دڕندایەتی، دوژمنکاری لە جۆری کوشتن، گوللەباران کردن، کۆیلە کردن، ڕاگواستن، زیندانی کردن، تەعەدا کردن لە ئافرەت یا کاری تری دژ بەمرۆڤ کە لەدژی هەر کەسێکی مەدەنی ئەنجام بدرێ یا ڕاونان بەهۆی بیروباوەڕی سیاسی، ڕەگەز یا باوەڕی ئاینی. بەبێ ئەوەی ڕەچاوی ئەوە بکرێ ئەم تاوانانە لەو وڵاتەدا کە ئەنجام دراون، پێشێلکردنی یاسان یان نا[٣١]. لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، لەو جۆرە تاوانانە لە کوردستان ئەنجام دراون، تەنانەت تەعەدا کردن لە ئافرەت لە ڕووداوەکانی باکوور و باشووری کوردستاندا دیار و ئاشکران.

بەندی چوارەمی پەیماننامەی ١٩٤٨ دەربارەی قەدەغەکردنی جینۆساید و سزا خستنە سەر تاوانکارانی دەڵێ: (کەسانی ئەنجامدەری جینۆساید یا هەر کارێکی تر لەوانەی کە لە بەندی سێهەمدا ناویان براوە/ وەکو: پیلان گێڕان بەمەبەستی ئەنجامدانی جینۆساید، هاندانی ڕاستەوخۆ و ئاشکرا بە مەبەستی جینۆساید و هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی جینۆساید/ سزا

دەیانگرێتەوە، بەبێ ئەوەی ڕەچاوی ئەوە بکرێ لە دەستوری حکوومەتەکەیاندا بەرپرسیارن یان نا، جا کەسانی ئاسایی بن یان فەرمانبەر)[٣٢].

لیژنەی یاسای نێودەوڵەتان لە ڕ. ن. ی (راپۆرتی ساڵی ١٩٨٦) لە خاڵی سێهەمدا (تاوانی دیکەی دژی ئاشتی و ئاسایشی مرۆڤایەتی). هەروەها ئەوە دیاری دەکات و دەڵێ: ئەو کارانە وەکو، بەشداریکردن، پیلان گێڕان، هەوڵدان لە بار و زرووفێکی دیاریکراودا کە ببێتە هۆی تاوانی دژی ئاشتی و ئاسایشی مرۆڤایەتی)[٣٣]، هەمان بیرورِا لە پەرەگرافی دووەمی بەندی دووەمی یاسای ژمارە ١٠ی دادگای نۆرنبێرگ_دا ئاشکرا دیارە دەڵێ کە هەرکەسێک بەبێ ڕەچاوکردنی نەتەوەیی یا پلەوپایەی ئەگەر یەکێک لەم کارانەی ئەنجام دابێ، بەئەنجامدەری تاوان دادەنرێ، ئەو کارانەش ئەمانەن:

١ - کەسی سەرەکی بێ، یا.

٢- هاوکار بێ لە ئەنجامدانی هەر تاوانێکدا ئەگەر فەرمانی دابێ یا هاندەری تاوان بێ.

٣- ڕەزامەندی دەربڕیبێ لەبەشداریکردنی تاواندا.

٤- بەشداربێ لەپیلاندانان یا ڕێگە خۆشکەر بێ، کە ببێتە هۆی ئەنجامدانی تاوان.

٥- بووبێتە ئەندام لە هەر گروپێک یا ڕێکخراوێک کە پەیوەندی بەئەنجامدانی هەر یەکێک لەو تاوانانەوە هەبێ[٣٤].

ئەوەشمان لەبیر نەچێ، کە دەستووری دادگای تۆکیۆ ١٩٤٦ لە ستروکتوردا وەکو دادگای نۆرنبێرگ وایە. دادگای تۆکیۆ، هەمان ئەو تاوانانەی کە لە دادگای نۆرنبێرگدا دیاری کراون، لە لیستی تاوانی نێونەتەوەییدا دیاری دەکات[٣٥].

دی ئەریچاگە، تاوانی نێونەتەوەیی وا دیاری دەکات کە (لە ئەنجامی شکاندنی پابەندێتی نێونەتەوەییەوە لەلایەن دەوڵەتەوە، کاتێک دروست دەبێت کە ڕەفتاری دژ بەیاسای نێونەتەوەیی ئەنجام بدرێ، ئەو پابەندێتییە

نێونەتەوەییەش، بەئەندازەیەک دەبێتە بناغەی بەرژەوەندییە گرنگەکانی ژیانی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی، هەر پێشێلکردنیان وەکو تاوانی سەرجەمی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی سەیر دەکرێ)(٣٦).

بەرپرسیارێتی یاسایی نێونەتەوەیی ئامرازێکی یاسایی پێویستە بۆدابینکردنی پاراستنی بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتان، ئەویش بە سەقامگیرکردنەوەی ئەو پەیوەندییە جیهانییەی کە پێشێل کراوە. هەر بۆیەش بەرپرسیارێتیی سوبێکتی یاسای نێودەوڵەتان، بەتوندی پەیوەندیی بەگرنگ گرتنی پاراستنی ڕەوایی نێونەتەوەیی و هەوڵدان بۆ جێگیر کردنی ئاشتی و دابینکردنی هاوکاری نێودەوڵەتی هەیە(٣٧).

پرۆژەی یاسای تاوانی دژی ئاشتی و ئاسایشی مرۆڤایەتی، پشت بە کۆمیتەی یاسایی نەتەوە یەکگرتووەکان دەبەستێ و پێی ڕەوایە (وڵاتێکی تر دەست لە کاروباری ناوخۆی ئەو وڵاتە وەردات کە لە سنوورەکەیدا تاوان کراوە یان هاووڵاتیانی زەرەرمەند بوونە، ئەو دەست تێوەردانەش دەبێ لە حاڵەتێکدا بێ، کە ئەو تاوانە ئەنجام درابێ وا هەڕەشە لە کۆمەڵگەی جیهانی دەکات یان سووکایەتی بە ویژدانی مرۆڤایەتی کردبێ جا چ بە زەبری بەرفراوانی یا بەژمارەی زۆری قوربانی یان کاری لەو جۆرەی کە لەکاتی جیاوازدا یا لە ناوچەی جیاجیادا ڕووی دابێ)(٣٨).

لە کۆبوونەوەی سی و حەوتەمینیساڵانەی لیژنەی یاسای نێودەوڵەتان لە ڕ. ن. ی ١٩٨٥، لە پرۆژەی بەرپرسیارێتی دەوڵەت، لە بەندی ١٤ خاڵی دووەمدا ئاشکرا ڕوون کراوەتەوە کە کاتێک دەوڵەت تاوانی نێونەتەوەیی ئەنجام دەدات، بەرپرسیارێتی بۆ وڵاتانی تریش دێتە ئاراوە کە:

١- نابێ دان بەوەدا بنرێ، ئەو ئەنجامەی تاوان هێناویەتیە ئاراوە، ئەنجامێکی ڕەوایە.

٢- یارمەتی و پشتگیری ئەو وڵاتە نەکرێ کە تاوانی کردووە لە پاراستنی ئەو زرووفەی کە تاوان دروستی کردووە.

٣- یەکگرتنی وڵاتان و ڕێگە خۆشکردن بۆ هاوکاری یەکترکردن لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیاندا، بەگوێرەی خاڵی ١ و ٢[٣٩].

لێرەدا مەبەست لە ڕەوایی دەست تێوەردانی کۆمەڵگەی جیهانییە لە کاروباری وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان، بەگوێرەی پرنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتان، چونکە جینۆساید لە ئارادایە. ئەو دەست تێوەردانەش دەبێتە هۆی بەرگرتنی جینۆساید و پشتگیری کردنی مافی گەلی کورد لە داکۆکیکردنی نێونەتەوەیی و دابینکردنی ژیان و بار و زرووفێکی ئاسایی گونجاو. ئەنجومەنی ئاسایشی ڕ. ن. ی دەسەڵاتی هەیە کە دادگایەکی جیهانی پێک بێنێ بۆ دادگاکردنی تاوانکارانی جینۆساید. لەم بارەیەشەوە بەندی چوارەمی پرۆژەی بەرپرسیارێتی دەوڵەت-لیژنەی یاسای نێودەوڵەتان- لە ڕ. ن. ی ١٩٨٥ دەڵێ:

(ئەنجامی یاسایی ڕەفتاری دەوڵەت لەدژی یاسای نێودەوڵەتان، دەبێ بەگوێرەی حوکمی باوی دەستوری ڕ. ن. ی دیاری بکرێ، لەبارەی پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەییەوە)[٤٠].

کاتێک لە بەرپرسیارێتی نێونەتەوەیی دەوڵەت دەدوێین، پێویستە پرنسیپە سەرەکییەکانی ئەم ئینستیوتە دیاری بکەین، چونکە چۆنێتی سروشتی یاسایی پیشان دەدات و سیستێمی گشتی بەرجەستە کردنی دیاری دەکات. ئەو پرنسیپانەش ئەمانەن:

١- پرنسیپی لەیەکچوونی بنچینەی بەرپرسیارێتی:

بەرپرسیارێتی نێونەتەوەیی دەوڵەت کاتێک دروست دەبێ ئەگەر بنچینەی یاسایی و ڕاستەقینەی پێویستی هەبێ. بنچینەی یاسایی بەرپرسیارێتی دەوڵەت بریتییە لە کۆمەڵێ فەرمانی بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتان. لەسەر بناغەی ئەو بنەمایانەش جۆری ڕەفتاری دەوڵەت وەکو یاسا پێشێلکەری نێونەتەوەیی ناوزەد دەکرێ و ئیتر مەسەلەی بەرپرسیارێتی نێونەتەوەیی دەوڵەتەکە دەخرێتە ڕوو[٤١]، بنچینەی ڕاستەقینەی بەرپرسیارێتی

نێونەتەوەیی دەوڵەت تەنیا بریتییە لە ئەنجامدانی یاسا پێشێلکردن لەلایەن دەوڵەتەکەوە[٤٢].

٢- پرنسیپی لەت نەبوونی بەرپرسیارێتی:

ئەو بەرپرسیارێتییەی لە ئەنجامی ڕەفتاری ئۆرگانەکانی دەوڵەتەوە دروست بووە، ئەو ئۆرگانانە خۆیانی لێ بەرپرسیار نین بەشێوەیەکی سەربەخۆ، بەڵکو دەوڵەتەکە خۆی بەرپرسیارە. بەرپرسیارێتی نێونەتەوەیی دەوڵەت بەسەر ئۆرگانەکانیدا دابەش ناکرێ، بەجۆرێکی سەرەکی دەوڵەت دەگرێتەوە[٤٣].

٣- پرنسیپی دابەشبوونی بەرپرسیارێتی:

ڕەفتاری کەسانی ئاسایی یا کۆمەڵێکی ئاسایی کە بەناوی دەوڵەتەوە کار نەکەن، وەکو ڕەفتاری دەوڵەتەکەیان سەیر ناکرێ و دەوڵەت بەرپرسیار نییە لە ئاستیان لە تاوانی نێونەتەوەییدا[٤٤]، بەڵام کەسانی ئاسایی یا فەرمانبەر کە بەناوی دەوڵەتەوە لە کاردابن یاوەکو ئۆرگانی دەوڵەت ڕەفتار بکەن، ئەو کاتە کارەکەیان وەکو ڕەفتاری دەوڵەتەکە سەیر دەکرێ و دەبێتە هۆی بەرپرسیارێتی نێونەتەوەیی دەوڵەت.

لە ئاستی تاوانی جینۆسایددا، دەوڵەت بەرپرسیارێتی نێونەتەوەیی سیاسی و ماتریالی (ماددی) دەکەوێتە ئەستۆی[٤٥]، پێویستە ئەو ڕاستییە لەبیر نەکەین بەربەرەکانی کردنی جینۆساید لە یاسای نێودەوڵەتاندا بریتییە لە بنەمایەکی ئیمپێراتیڤانە (آ مر-Jus Congens) و هەموو وڵاتان لەسەریانە لەکاردا بن لە دژی جینۆساید، جا مەرج نییە کە بەشداری پەیماننامەی قەدەغەکردنی جینۆساید و سزا خستنە سەر تاوانکاران بن[٤٦].

ی. براونلی لەو بارەیەوە دەڵێ: (دەست بەکارکردن یا نەکردن، کە ببێتە هۆی شکاندنی پابەندێتی یاسایی، بەرپرسیارێتی یاسایی نێونەتەوەیی دروست دەکەن، جا ئەوە ڕەچاو ناکرێ کە ئەو پابەندێتییە لە ڕێکەوتننامەوە یا داب و نەریت یا هەر بناغەیەکی ترەوە پێگەی دانابێ[٤٧].

٤- پرنسیپی هاوئاهەنگی (التناسبية):

قـەبارەو جـۆر و فـۆرمـی بـەرپرسـیـاریتـی دەوڵـەتی یاسـا پێـشـێلـکەر، دەبێ هاوئاهـەنگ بن لەگەڵ مەوداو سروشـتی ئەو زیانەی کە پێشێل کردنی یاسای نێـودەوڵەتان دروسـتـی کـردووە لە سنووری پێـویست تێ نەپەڕێ، بۆ قـەرەبۆکردنـەوەیەکی عـادیلانەی زیانی سـوبیێکتی (لایەنی) تاوان لێکراو بۆ سەقامگیرکردنەوە و پشتگیری کردنی سیستێمی یاسایی نێونەتەوەیی[٤٨].

٥- پرنسـیـپی لەیەکـچـوونی ئامـرازی دادگـایی کـردن (وسـائل المرافـعـة) لە جێبەجێ کردنی بەرپرسیاریتی دەوڵەتدا:

بەرپرسـیـاریتـی دەوڵـەت دەبێ وا دیاری بکرێ لە چوارچێـوەی فـۆرمـێکی دادگایی دیاریکراودا بێ و بەگوێرەی ئەو سیستێمەی کە لەئەنجامی پێویستی یاسایی نێودەوڵەتانەوە پەیدا بوو[٤٩].

لە جـێـگەیەکی تردا بـەندی دووەمی یـاسـای ژمـارە ١٠ی دادگـای نورنبێرگ/خاڵی ٤/ دەڵێ:

(پایەی ڕەسمی هەر کەسێک، سەرۆکی دەوڵەت بێ یا سـەرانی لێپرسراوی کارگێڕی حکوومـەت بێ، لەبەرچاو ناگیـرێ و لە بەرپرسـیـاریتی تاوانـەکەی دەربازی ناکاتـو ناشبێتـە هۆی سووک کردنی سزاکەی). کەواتە سـەرۆکی دەوڵەت یا کەسێکی ئاسایی کە ئەنجامدەری جینۆساید بێ لە بەرپرسیاریتی تاوانکاری-جنائی- مەرخەس نابێت.

ئەگـەرچی بڕگـەی -B- لە بـەندی دووەمی یـاسـای ژمـارە ١٠ی دادگـای نۆرنبـێرگـدا دیاری دەکـات کە (ئەگـەر یەکێک فـەرمـانی حـکوومـەتەکـەی یا فەرمانی لێپرسراوی سەرووی خۆی جێبەجێ کرد لە بەرپرسـیاریتی تاوان دەرباز نابێت، بەڵام ڕەنگە ببێـتـە هۆی سـووک کردنی حـوکـمـەکەی لە کـاتی دیاریکردنی سزاکەیدا)[٥٠].

زۆر گـرنگە ئەو ڕاسـتـیـیـە باس بکەین، جـینۆسـاید لەبەر ئەوەی تاوانێکی نێونەتەوەیی ترسناکە، تێپەڕبوونی کـاتی بۆ ڕەچاو نـاکرێ و بەرپرسـیـاریتی نێونەتەوەیی هـەر دەمێنێ[٥١]، بەگوێرەی بەندی یەکـەمـی پەیماننامـەی ڕەچاو

نەکردنی کات بەسەرچوونی تاوانی جەنگ و تاوانی دژی مرۆڤایەتی ساڵی ١٩٦٨: (تاوانی دژی مرۆڤایەتی، گوێ بەوە نادرێ لە کاتی جەنگدا یا لە سەردەمی ئاشتیدا ئەنجام دراوە، هەر وەکو لە دەستووری دادگای سەربازی نۆرنبێرگ لە ١٩٤٥/٨/٨ دا دیاری کراوە: ڕاونان لە ئەنجامی هێرشی چەکداری یا داگیرکردن و ڕەفتاری دژ بەمرۆڤ، ئەوانە ئەنجامی سیاسەتی ئەپارتید و جینۆسایدن کە لە پەیماننامەی ١٩٤٨دا دەربارەی قەدەغەکردنی جینۆساید و سزا خستنە سەر تاوانکارانیدا دیاری کراوە. ئەگەر چی ئەو کارانە بەگوێرەی یاسای ناوخۆی ئەو وڵاتەی لێیان ئەنجام دراوە، یاسا شکاندنیش نەبن)[٥٢].

هەر لەبارەی مەبەستی ڕەچاو نەکردنی سەردەمی تاوانی نێونەتەوەیی، بەندی پێنجەمی ڕاپۆرتی لیژنەی یاسای نێودەوڵەتان ڕ. ن. ی جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە: (تاوانی دژی ئاشتی و ئاسایشی مرۆڤایەتی بە حوکمی خەسڵەتەکەی بەر حوکمی سەردەمی بەسەرچوو ناکەوێ)[٥٣].

بەگوێرەی ئەو لێکۆڵینەوەیەی خستمانە ڕوو، بەپشت بەستن بەو بەڵگەنامە یاساییە نێونەتەوەییانە، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە گەلی کورد تاوانی جینۆسایدی بەسەردا جێبەجێ دەکرێ. ئەم تاوانە نێونەتەوەییەش، پێشێل کردنێکی زۆر زەق و ترسناکی مافی گەلی کوردە. بۆیە وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان و کەسانی نوێنەرانی ئەو وڵاتانە بەرپرسیارێتی یاسایی نێونەتەوەیی دەکەوێتە ئەستۆیان بەبێ ئەوەی سەیری ئەوە بکرێ تاوانەکانیان لە سیاسەت_و یاسای ناوخۆدا قەدەغەن یان نا، بەبێ ئەوەی سەیری ئەوە بکرێ بەشدارن لە پەیماننامەی ١٩٤٨دا بۆ قەدەغەکردنی جینۆساید یان نا.

جارێ کۆمەڵێ بڕیار و ڕاپۆرت و یاسای ئەو وڵاتانە کە حوکمی یاساییان هەیە، خۆی لەخۆیدا نیسپات کردنێکی پێش وەختەی تاوانی جینۆسایدە. جینۆساید وەکو تاوانێکی سەربەخۆ، زۆر ترسناک و دڕندانەیە، بۆیە سیاسەتی ئەو وڵاتانە دەرهەق بەگەلی کورد تەواو دژو ناکۆکە لەگەڵ بنەما گشتی و پرنسیپە دان پێدانراوەکانی یاسای نێودەوڵەتاندا. بەگوێرەی ئەوەی

ئەو بنەمـایانە (ئیمـپێراتیـڤن) واتە حـوکمـێکی بـاڵایان هەیە Jus Cogens، وڵاتانی دنیا لەسەریانە:

١- لەسـەر داخوازی ئەنجومەنی ئاسایش، هاوکاری گەلی کورد بکەن لەدژی جـینۆسـاید، تاکـو ئەو گـەلەش بەشـداربێ لە پرۆسـەی پاراستن و دابینکردنی ئاشـتی و ئاسایشی نێونەتەوەیـی، بەندی ٤٢ دەسـتووری ڕ. ن. ی.

٢- تاوانی جینۆساید ئەنجام نەدەن و لە تیۆری و پراکتیکدا قەدەغەی بکەن.

٣- ئەو یاسـایانە هەڵبـوەشـێننەوە کـە دەبنە هـۆی جـینۆسـاید و یاسـای کارگێڕیی قەدەغەکردنی تیۆری و پراکتیکی جینۆساید دەربکەن.

٤- سـزا بخـەنە سـەر ئەو وڵاتانەی جـینۆساید پەیڕەو دەکـەن لە دژی گـەلی کورد.

بەم جـۆرە، وڵاتە داگیرکـەرەکانی کـوردسـتـان بەرپرسـیـارێتی سیـاسی و مـاتریاڵی هەڵدەگرن. لەبەرئەوەی جینۆسـاید هەڕەشـە لە ئاشـتی و ئاسایشی نێـونەتـەوەیی دەکـات. بۆیە هەمـوو وڵاتێک مـافی ئەوەی هەیە مـەسـەلەی جـینۆسـاید لە چوارچێـوەی ڕ. ن. ی دا بەرز بکاتەوە، سـەربـاری ئەوەش، بەحـوکمـی پرنسیپی یەکسـانی و دیاریکردنی چارەنووسی گەلان و میللەتان، لەبەر ئـەوەی گەلی کـورد لە چوارچێوەی ئەو وڵاتـانەی کە پێوەی لکێندراوە- ئێران، عێراق، سوریاو تورکیا-، هەمـوو مافێکی پێشێل کراوە و بەر پەلاماری هەمـەلایەنەی قـڕکـردن کـەوتووە، مـافی دووبـارە دیاریکردنەوەی چارەنووسی خـۆی هەیەو خـەباتکردن بۆ بەرزکـردنەوەو بەئەنجـام گـەیاندنی ئەو مـافـانە کـارێکی ڕەوایە، چونکە بەسیـاسـەتی ئەو وڵاتانە گەلی کورد بار و زرووفێکی سەختی بۆ دروست کراوە هەڕەشـە لە بوونی دەکـات. ئەنجـومـەنی ئاسـایشی UN دەسـەڵاتی هەیە ئەم کێشـەیە بخـاتە بەر باس و لێدوان و چارەسـەری بۆ دابنێ، چونکە ئەو تاوانانەی لە دژی گەلی کورد دەکرێن، هەر تاوانی ئاسـایی و کـاتی نین، ئاشـتی و ئاسـایشی نەک هـەر ئەو گـەلە، بەڵکو نێـونەتـەوەیی

دەخەنە مەترسییەوە و تاوانیشە لەدژی مرۆڤایەتی.

ئەوەی ڕاستی و بەڵگەنامەی جیهانی بەمرۆڤایەتی ڕەوا بینیوە، لە دژی تاوانی نێونەتەوەیی، ئێمە هەوڵمان داوە لایەنە ڕوونەکانی بخەینە ڕوو بۆ ئەوەی حوکمی یاسای نێودەوڵەتان لەو بارەیەوە لە ئاستی میللەتێکی ژێرپێ خراوی وەکو کورددا ڕوون بکەینەوە، بەڵام میکانیزمی جێبەجێ کردنی ئەو حوکمانە، زۆرجار لە پێناوی بەرژەوەندی و سیاسەتی جیهانیدا پێچەوانە دەکرێتەوە، ئالێرەوە، بە پلەی یەکەم ئەرکی گەورە دەکەوێتە سەر گەلی کورد لە ئیسپاتکردنی واقیعی ژیانی خۆی.

## پەراوێزەکانی بەشی سێیەم


١- ڤ. ئە. ڤاسیلێنکە: سزای یاسایی- نێونەتەوەیی. کییف، ١٩٨٢، ل ٥١ (بەزمانی ڕووسی).

٢- ڤ. ئە. ڤاسیلێنکە: بەرپرسیارێتی دەوڵەت لەپێشێلکردنی یاسای نێونەتەوەییدا. کییف، .١٩٧٦ ل١٧(بەزمانی ڕووسی).

٣- دەستووری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان. مۆسکۆ، ١٩٧٦ ل٢٤ (چاپی ڕووسی).

٤- دەستووری ڕ. ن. ی. ل٦.

٥- کارنامەی ڕ. ن. ی لە بواری مافی مرۆڤدا. لەبارەی دان پێدانانی دیاریکردنی چارەنووسەوە وەکو مافی مرۆڤ. نیویۆرک. ،١٩٨٣ ل.١٨ خاڵی ٧ (بەزمانی ڕووسی).

٦- هەمان سەرچاوە. ل١٨.

٧- مازەڤ. ڤ. ئە. بەرپرسیارێتی لە یاسای نێودەوڵەتاندا. مۆسکۆ، ١٩٧٩. ل١١(بەزمانی ڕووسی).

٨- بلیۆنچلی. ی.: یاسای تازەی نێودەوڵەتان لە وڵاتانی شارستانی لە شێوەی یاسادا. مۆسکۆ، ١٩٧٨. ل٢٨٣ (بەزمانی ڕووسی).

٩- کەریتس. ی. ی.: تاوانی خەسڵەت نێونەتەوەیی. مۆسکۆ، ١٩٧٩. ل٢٤ (بەزمانی ڕووسی).

١٠- الدكتور محمد العودات: التلوث وحماية البيئة. دمشق، ١٩٨٨. ص٢٨.

١١- الدكتور محمد العودات: التلوث وحماية البيئة. ص١٤٧.

١٢- کەرپێتس. ی. ی. : تاوانی خەسڵەت نێونەتەوەیی. ل٣٤.

١٣- ئەبەرنیکۆف. ف. پ.، کراسولین. ب. پ. چەک داماڵین. مۆسکۆ، ١٩٨٨. ل٢١٩ (بەزمانی ڕووسی).

١٤- یاسای نێودەوڵەتان لە بەڵگەنامەدا. مۆسکۆ، ١٩٨٢، ل ٥٩٦، (بەزمانی ڕووسی).

١٥- سیستێمی نێونەتەوەیی: لایەنی سیاسی-یاسایی، بە سەرپەرشتی: شاه نزارۆف. گ. خ، مۆسکۆ، ١٩٨٦، ل.١٠٠(بەزمانی ڕووسی).

١٦- دەستووری ڕ. ن. ی، مۆسکۆ، ١٩٧٦، ل٢٢(چاپی ڕووسی).

١٧- دەستووری ڕ. ن. ی.، ل٢٣.

١٨- کەرپێتس. ی. ی. : تاوانکاری نێونەتەوەیی. مۆسکۆ، ١٩٨٨ ل١٠١ (بەزمانی ڕووسی).

١٩- یاسای نێودەوڵەتان لە بەڵگەنامەاندا. پەیماننامەی قەدەغەکردنی تاوانی جینۆساید و سزاخستنە سەر تاوانکاری، ساڵی ١٩٤٨. مۆسکۆ، ١٩٨٢. ل٢٣٢ (بەزمانی ڕووسی).

٢٠- زنجیرەی یاسای نێودەوڵەتان. حەوت بەرگ، بەرگی یەکەم. مۆسکۆ، ١٩٨٩ ل٢٨٧ (بەزمانی ڕووسی).

٢١- مینگازەف. ل. خ. : کاریگەریتی بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتان. قازان، ١٩٩٠ ل١٨٨ (بەزمانی ڕووسی).

٢٢- بوتکێڤیچ. ڤ. گ. : پەیوەندی یاسای ناوخۆی دەوڵەت و یاسای نێودەوڵەتان. کییڤ، ١٩٨١ ل٢٧٩ (بەزمانی ڕووسی).

٢٣- خالد خالد: کیف تعالج الدساتیر العراقیة الحقوق القومیة للشعب الکردي. ستۆکهۆڵم، ١٩٩٠ ل٥٦.

٢٤- مسالة الاقلیات القومیة في الوطن العربي. دار الثورة. بغداد. ص٧.

٢٥- مینگازەف. ل. خ.: کاریگەریتی بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتان. قازان، ١٩٩٠ ل١٩١.

٢٦- هەمان سەرچاوە. ل١٩٢.
٢٧- مەنییچوک. یو. ف. ئەنجامی پێشێلکردنی یاسای نێودەوڵەتان. کییڤ، ١٩٨٧ ل٧ (بەزمانی ڕووسی).
٢٨- دەستووری ڕ. ن. ی. ل٧.
٢٩- کولیکۆف. ڕ. نو.: بەرپرسیارێتی یاسایی نێونەتەوەیی لە پێشێلکردنی مافی مرۆڤدا. مۆسکۆ، ١٩٧٩ ل١٤ (بەزمانی ڕووسی).
٣٠- ئەندریۆخین. م. ن. : جینۆساید لە سیاسەتی وڵاتە ئیمپریالییەکاندا. مۆسکۆ، ١٩٦٧ ل٣٤ (بەزمانی ڕووسی).
٣١- دادگای نۆرنبێرگ. هەشت بەرگ. بەرگی یەکەم. مۆسکۆ، ١٩٨٧ لە١٦٠ (بەزمانی ڕووسی).
٣٢- یاسای نێودەوڵەتان لەبەڵگەناماندا. دەقی پەیماننامەکە، ل٢٣٢.
٣٣- ساڵنامەی لیژنەی یاسای نێودەوڵەتان ١٩٨٦ بەرگی دووەم، بەشی دووەم. ڕ. ن. ی. نیویۆرک، ١٩٨٩ ل٥٨ (بەزمانی ڕووسی).
٢٤- دادگای نۆرنبێرگ. بەرگی یەکەم. ل١٦٠- ١٦١.
٢٥- نیکۆلاییف. ئە. ی. تۆکیۆ- دادگای گەلان، مۆسکۆ، ١٩٩٠. ل٣٢، ٣٧ (بەزمانی ڕووسی).
٣٦- دی ئەریچاگەئی. خ. : یاسای تازەی نێودەوڵەتان. مۆسکۆ، ١٩٨٣. ل٤١٤ (بەزمانی ڕووسی).
٣٧- زنجیرەی یاسای نێودەوڵەتان. حەوت بەرگ. بەرگی سێیەم. مۆسکۆ، ١٩٩٠. ل١٩٠ (بەزمانی ڕووسی).
٣٨- ساڵنامەی لیژنەی یاسای نێودەوڵەتان ١٩٨٦. بەرگی دووەم، بەشی یەکەم. ڕ. ن. ی- نیویۆرک. ل٦٧ (بەزمانی ڕووسی).
٣٩- ساڵنامەی لیژنەی یاسای نێودەوڵەتان١٩٨٥. بەرگی یەکەم. نیویۆرک، ١٩٨٨ ل١٠٦ (بەزمانی ڕووسی).
٤٠- هەمان سەرچاوە. ل١٠٥.
٤١- داڤید. ف. ڤاسیلێنکە. ف.: میکانیزمی پاراستنی سیستێمی یاسایی نێونەتەوەیی. برنۆ-سلۆڤاک ١٩٨٦ ل٥٢ (بەزمانی ڕووسی).

٤٢- هەمان سەرچاوە. ل٨٨.

٤٣- هەمان سەرچاوە. ل٨٩.

٤٤- هەمان سەرچاوە. ل٩٣.

٤٥- ئەندریۆخین. م. ن. : جینۆساید لە سیاسەتی ولآتە ئیمپریالییەکاندا. مۆسکۆ، ١٩٦٧. ل٣٧ (بەزمانی ڕووسی).

٤٦- کۆلیکۆف. ڕ. ئۆ. : بەرپرسیاریتی یاسایی-نێونەتەوەیی لەپێشێلکردنی مافی مرۆڤدا. مۆسکۆ، ١٩٧٩. ل٣٨ (بەزمانی ڕووسی).

٤٧- براونلی. ی. : یاسای نێودەوڵەتان. کتێبی دووەم. / گۆڕینی لە ئینگلیزییەوە: س. ئەندریانەڤ/ مۆسکۆ، ١٩٧٧. ل٨٢ (بەزمانی ڕووسی).

٤٨- داڤید. ڤ.، ڤاسیلێنکە. ڤ.: میکانیزمی پاراستنی سیستێمی یاسایی نێونەتەوەیی. برنۆ-سلۆڤاک، ١٩٨٦. ل٩٨ (بەزمانی ڕووسی).

٤٩- هەمان سەرچاوە. ل١٠١.

٥٠- دادگای نۆرنبێرگ. بەرگی یەکەم. ل١٦١.

٥١- دکتور عبدالرحیم صدقي: دراسة للمبادئ الاصولية للقانون الدولي الجنائي في الفكر المعاصر./ المجلة المصرية للقانون الدولي. المجلد الاربعون. القاهرة، ١٩٨٤. ص٧١.

٥٢- یاسای نێودەوڵەتان لە بەڵگەناماندا. مۆسکۆ، ١٩٨٢. ل٨٣٤.

٥٣- ساڵنامەی لیژنەی یاسای نێودەوڵەتان. بەرگی دووەم. بەشی دووەم. نیویۆرک، ١٩٨٩. ل٥٠ (بەزمانی ڕووسی).

## ئەنجام

وەکـو ڕوونمان کـردەوە، جـینۆسـاید لەبەرئەوەی تاوانێکی دڕندانەیە لەدژی مرۆڤایەتی، بۆیە لە یاسـای تازەی نێودەوڵەتاندا وەکو تاوانێکی سـەربەخۆ و ترسناک دیاری کراوە.

جـینۆسـاید نـەک هـەر نەهێـشـتنی بـەدەنی کـۆمـەڵێ مـرۆڤـە، بەڵکو جـۆری تریشی هەیە، فـەوتاندنـی کـەلتـووری نەتەوەیی، جـینۆسـایدی بیـۆلۆژی و ئابووری. لە باکـوور و باشـووری کـوردسـتـان، ڕژێمی تورکـیـاو عێـراق بە وێرانکردنی سەراپاگیریی ناوچەکان، سـەرباری سیاسەتی جینۆساید، تاوانی ئیکۆسـاید-وێران کـردنی ئێکۆلۆژیا-یان ئـەنجـام داوە. ئەویش وێرانکردن و لەوتاندنی ژینگەیە، کە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی کوشتنی ژیان بەگشتی لەو ناوچانەدا، واتە تـاوانێکی دیکەش ئـەنجـام دەدرێ ئـەویش (بیـۆسـاید). کـە دەتوانین بەم جـۆرە سـیـاسـەتی دژ بەگـەلی کـورد دیاری بکەین: (تـاوانی جینۆساید و Genocid– تاوانی ئیکۆساید Ecocide– تاوانی بیۆساید Bio-cide). لە جێبەجێ کردنی تاوانی جینۆساید دا، کەم و زۆری ژمارەی قوربانی و زەرەرمـەندیی ڕەچاو ناکرێ، چونکە هـەر مـەبەست لە تاوانەکە فەوتاندنێکی سەراپاگیرییە، ئەویش دەبێتە هۆی زەبرێکی ترسناک لە مرۆڤایەتی و تێکدانی ئاشتـی و ئاسایش و گـوزەرانـی ئاسایی مرۆڤ. بۆیە ئەم تاوانە ڕاستـەوخۆ پێشێل کردنی بنەما و پرنسیپەکانی یاسـای نێودەوڵەتانە، هەر لەبەر ئەوەش، تێپەڕبوونی کات لەبەرچاو ناگیرێ، واتە بەرپرسیـارێتی لەسەر ئەو تاوانە هەر دەمێنێ و تاوانـکار چ وەک حکوومـەت یا فـەرمـانبـەر و کـارمـەندی دەوڵەتان یا کەسانی ئاسایی نابێ قوتاربن.

لە بەشـەکانی کوردستاندا، مێتۆدی هەمە چەشنە بەکاردێت بۆ جێبەجێ

کردنی سیاسەتی ئەو ڕژێمانە، بەڵام خاڵی سەرەکی سەرجەم سیاسەتی هەر چوار وڵاتی داگیرکەری کوردستان هاوبەشەو هەمیشە توانیویانە لەسەر لێدانی بزووتنەوەی کورد و وێرانکردنی کوردستان و فەوتاندنی نەتەوەیی کورد وەکو گەلێکی سەربەخۆ، یەک بگرن. جۆری جێبەجێ کردنی سیاسەتی ڕژێمی عێراق و تورکیا جیاوازە و تارادەیەکی زۆر نزیکە لە یەکەوە. کاری دیاری ئەو سیاسەتەش کە بەئەنجام گەیشتووە دەکرێ لەم خاڵانەدا دیاری بکرێ:

١- بەکۆمەڵ کوشتن.

٢- بەکۆمەڵ ڕاگواستن.

٣- تەعریب و تەتریک (عەرەباندن و تورکاندن).

٤- وێرانکردنی کوردستان (بەتاڵان کردنیشەوە).

٥- شێواندنی مێژوو و کەلتووری کورد.

٦- دروستکردنی باری نائاسایی کە دەبێتە هۆی پەڕەوازە و کەم بوونەوەی خەڵکی کوردستان.

٧- بەکارهێنانی سیاسەتی برسیکردن و گەمارۆی ئابووری.

٨- میلیتاریزەکردنی کوردستان.

٩- مین ڕێژکردنی ناوچە کوردییەکان.

١٠- تێکدانی سروشت و جوگرافیای ناوچەکانی کوردستان، بەتایبەتیش تێکدانی دیموگرافی دانیشتوان.

بەڵام سیاسەتی ڕژێمی ئێران و سوریا لە جێبەجێ کردندا، هەندێ جیاوازە لەگەڵ عێراق و تورکیا، ئەگەرچی لەهەر یەکێ لەو وڵاتانەدا، هەر داوایەکی گەلی کورد بە چەک و ئاگر وەڵام دەدرێتەوەو ماڵ و حاڵی خەڵکەکە وێران دەکرێ، پێمان وایە ئەو جیاوازییە لەبەر ئەوەیە کە بزوتنەوەی ڕزگاری کورد لەو دوو بەشەی کوردستاندا چالاکی و خەباتیان جیاوازترە وەکو لە باکوور و باشووری کوردستان، هەر کاتێک ئەو بزووتنەوەیە لەو ناوچانەشدا پەرەی

سەندبێ، ئەوا سیاسەتی ڕژێمەکانیش توندتر و خراپتر بووە. سیاسەتی ڕژێمی ئێرانیش لەم خاڵانەدا کۆ دەکەینەوە:

١- بەکۆمەڵ کوشتن.

٢- بەکۆمەڵ ڕاگواستن.

٣- شێواندنی مێژوو و کەلتووری کورد.

٤- تەفریس کردن (بەفارس کردن).

٥- وێرانکردنی دێهاتەکان.

٦- گەمارۆی ئابووری.

٧- میلیتاریزەکردنی کوردستان.

٨- تێکدانی سروشت و جوگرافیای کوردستان.

٩- مین ڕێژکردنی ناوچەکان.

لە ڕۆژئاوای کوردستانیش، لەبەرئەوەی شەڕ نییە، بۆیە جۆری جێبەجێ کردنی سیاسەتی ڕژێمی سوریا جۆرێکی ترە. ئەو جۆرە تاوانەش لە یاسای نێودەوڵەتاندا بە جینۆسایدی سەردەمی ئاشتی ناسراوە، چونکە ئەم تاوانە چ لە سەردەمی شەڕدا یا لە سەردەمی ئاشتیدا ئەنجام دەدرێ. بۆیە دەبینین ئەو سیاسەتەی ڕژێمی سوریا بەکاری دێنێ لەدژی گەلی کورد بریتییە لە:

١- فەوتاندنی گەلی کورد، بەشێوەی تواندنەوەی لەعەرەبدا، بۆ ئەمەش عەشایری عەرەب لە ناوچە کوردییەکاندا نیشتەجێ دەکرێن و چەکداریش دەکرێن.

٢- بە مەترسی زانینی کورد و بزووتنەوەکەی لەسەر گەلی عەرەب.

٣- بەکۆمەڵ ڕاگواستن.

٤- تەعریب کردنێکی بەرنامەڕێژکراو.

٥- قەدەغەکردنی زمان و کەلتوور و شێواندنی مێژووی گەلی کورد.

٦- بەکارهێنانی سامانی کوردستان لە دژی گەلی کورد خۆی.

٧- بەکارهێنانی سیاسەتی (تجهیل).

٨- بەکارهێنانی پرۆژەی-کێڵگەی دەوڵەتی- بۆ داگیرکردنی کوردستان بە سوپا و دابڕینی خەڵکی ناوچە سنوورییەکان لە هەردوو دیوی سنووری نێوان سوریا عێراق و تورکیا.

٩- بێ بەریکردنی خەڵکێکی زۆر (بە هەزاران) لە مافی هاونیشتمانیتی، کە ئەمەیان مردنێکی لەسەرخۆیە. مرۆڤی بێ دۆکومێنت هیچ مافێکی نییە.

١٠- کۆنترۆڵکردنێکی بەردەوامی خەڵکی کوردستان بە سوپا و دەزگای جاسوسی.

خاڵێکی گرنگ کە هەر چوار وڵاتەکە بەیەکەوە گرێ دەدات، ئەویش کۆمەڵێ ڕێکەوتننامە و پەیماننامەیە لە نێوانیاندا بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوەی کورد و بە مەترسی زانینی هەر سەرکەوتنێکی گەلی کورد لەسەر خۆیان و وڵاتەکەیان، کە بەردەوام خەڵکی مەدەنی و ناوچە مەدەنییەکانیشی گرتووەتەوە. لەکاتی نووسینی ئەم چەند لاپەڕەیەدا، سوپای تورکیا (٤٠) چل کیلۆمەتر سنووری تورکیای بڕیوەو پەڕیوەتەوە ناوچەکانی بادینان لە خوارووی کوردستانی بە عێراقەوە لکێندراو، کە ژمارەیەکی زۆر خەڵکی مەدەنی لەهەر دوو دیوی کوردستان بەر هێرش و پەلامار کەوتوون و ئاوارە بوونە. (مانگی ئازاری ١٩٩٥).

لە ئەنجامی تاوانی فاشیستەکان و لەدوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە، ئەو پرنسیپ و فۆرمە یاساییانەی کە تاوانی نێونەتەوەیی قەدەغە دەکەن و سزا دەخەنە سەر تاوانکارانی، لە یاسای نێودەوڵەتاندا جێگیر کران. ئیتر جینۆساید بەرپرسیارێتی نێونەتەوەیی خرایە سەر. دەستووری ڕێکخراوی UN، پەیماننامەی ١٩٤٨ دەربارەی قەدەغەکردنی تاوانی جینۆساید و سزا خستنە سەر تاوانکارانی، پرنسیپەکانی دادگای نۆرنبێرگ و گەلێ بەڵگەنامەی تر ئەو ڕاستییە یاساییە دەچەسپێنن، کە تاوانی نێونەتەوەیی هەڕەشە لەمرۆڤایەتی دەکات، بۆیە هەر وڵاتێک چ بەشداربێ لە پەیماننامە و

ڕێکەوتننامەی جیهانیدا بۆ قەدەغەکردنی جینۆساید یا بەشدار نەبێت، ئەوا یەکەم: بەرپرسیار دەبێ بەرامبەر جینۆساید ئەگەر ئەنجامی دا، دووەم: لەسەریەتی ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات کە لەبەربەند کردن و سزادانی تاوانی جینۆسایددا دێتە ئاراوە. چونکە پابەندێتی نێونەتەوەیی خەسڵەتێکی باڵای هەیەو وڵاتە ئەندامەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەرپرسیارن لە ڕێزگرتنی مافی مرۆڤ، کە زەمینەی لە دابینکردنی پرنسیپی مافی چارەنووسی گەلانەوە بۆ خۆش دەبێ و بناغە دادەکوتێ.

جێگەی داخە، جێبەجێ کردنی بەرپرسیارێتی نێونەتەوەیی لە بەربەرەکانی کردنی جینۆسایددا، بەتایبەتیش بەرامبەر بە گەلی کورد، هەتا ئەم ڕۆژگارەش لە ڕوانگەی بەرژەوەندیی و سیاسەتی وڵاتانی ناوچەکە و گرێدانی بە سیاسەتی جیهانییەوە سەیر دەکرێ، بۆیە لێرەدا بەپلەی یەکەم گەلی کورد خۆی لەبەر ئەوەی خاوەنی مەسەلەکەیە بەهۆی بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوەییەوە، ئەرکێکی مێژوویی و نەتەوەیی دەکەوێتە ئەستۆ بۆ ئەوەی بتوانێ لەسەر شانۆی سیاسەتی جیهانیدا، یاسای نێودەوڵەتان، وەکو ئامرازێکی کاریگەر بەکاربێنێ بۆ داکۆکیکردن لە بوونی خۆی و قەناعەت پێکردنی وڵاتانی دنیا بە مەسەلەی ڕەوا و جەختکردن لەسەر ئەوەی کە جینۆسایدی گەلی کورد گەیشتووەتە ئەندازەیەکی ترسناک کە پاشەڕۆژی ئەو گەلە لە مەترسیدایە، ئەویش مەترسی لەسەر مرۆڤایەتی دروست دەکات.

# سەرجەمی سەرچاوەکان

به زمانی کوردی:


١- ئیسمایل بێشکچی (دکتۆر): کوردستان کۆلۆنییەکی نێونەتەوەیی. وەرگێڕانی له ئینگلیزییەوە: ڕێبوار ڕەشید. هەولێر، ١٩٩٣.

٢- بلەج شێرکۆ (دکتۆر): کێشەی کورد، مێژینه و ئێستای کورد. محەمەد حەمه باقی له عەرەبییەوە کردوویە به کوردی. سەقز ١٩٩٠.

٣- جەمال نەبەز (دکتۆر): بیری نەتەوەیی کورد نه بیری (قەومیەت)ی ڕۆژهەلاتی و نه بیری ناسیۆنالیزمی ڕۆژئاواییه. ستۆکهۆلم، ١٩٨٤.

٤- جەمال نەبەز: کوردستان و شۆڕشەکەی. کوردۆ له ئەڵمانییەوە کردوویەتی به کوردی. ستۆکهۆلم، ١٩٨٥.

٥- جەمال نەبەز: ئێستە و پاشەڕۆژی نەتەوەی کورد لەبەر ئاگری جەنگی عێراق و ئێراندا. ستۆکهۆلم، ١٩٨٧.

٦- چیا: ئەمنی ستراتیژیی عێراق و سێ کوچکەی بەعسییان: تەرحیل، تەعریب، تەبعیس، چاپی یەکەم، ١٩٨٧.

٧- ڕادوڤان باڤیچ (پرۆفیسۆر): جووڵانەوەی ڕزگاریخوازانەی کورد له خەباتیدا بۆ سەربەخۆیی نەتەوایەتی و سیاسی. مەحمود مەلا عزەت کردوویەتی به کوردی. سوید، ١٩٨٥.

٨- عەبدولرەحمان قاسملۆ (دکتۆر): چل ساڵ خەبات لەپێناوی ئازادی. بەرگی یەکەم، چاپی دووەم.؟ ١٩٨٨.

٩- عەبدوڵڵا قەرەداغی (مەلا عەلی): ڕاگوێزانی کورد له مێژوودا. سوید، ١٩٩١.

١٠- عەبدولڕقیب یوسف: بانگەوازێک بۆ ڕووناکبیرانی کورد. سلێمانی، ١٩٨٥.

١١- عەزیز شەمزینی (دکتۆر): جووڵانەوەی ڕزگاریی نیشتمانی کوردستان. ف. ئەسەسەرد له عەرەبییەوە وەری گێڕاوە. چاپی دووەم، ١٩٨٥.

١٢- كريس كۆچيرا: مێژووی کورد له سەدەی نۆزدەو بیست_دا. وەرگێڕاوی: محمد ریانی. تاران، ١٩٩٢.
١٣- کەریمی حیسامی: کۆماری دیموکراتی کوردستان یان خودموختاری. چاپی دووەم. سوید، ١٩٨٦.
١٤- مەهاباد کوردی: گەشتێک بۆ باکووری کوردستان. سوید، ١٩٩١.
١٥- نەوشیروان مستەفا ئەمین: حکوومەتی کوردستان. نۆترێخت. هۆڵەندا، ١٩٩٣.

***

## لێکۆڵینەوە و وتار بەزمانی کوردی

١٦- دۆستی: کیدری و باری سیاسی کوردستانی سەروو/ هەڵوێست (گۆڤار). لەندەن، ژمارە ٢/ ١٩٨٤.
١٧- دیدار: گەلی کورد له کوردستانی سوریاو چارەنووسێکی نادیار / سەردەمی نوێ (ڕۆژنامە)، ستۆکهۆڵم. ژمارە-٤٥-، نۆڤەمبەری ١٩٨٩.
١٨- ڕەشاد میران: هەڵسەنگاندنی ڕوانینێکی عەرەبی بۆ کێشەی کورد/ ڕابوون (گۆڤار). ستۆکهۆڵم، ژمارە-١- ١٩٩١.
١٩- ڕێناس: دامەزراندنی دەوڵەتی سوری و کێشەی کورد له سوریا. وەرگێڕانی له فەرەنسییەوە: خانی شەرەفکەندی/ هیوا (گۆڤار). پاریس، ژمارە-٧- ١٩٩٠.
٢٠- سەربەست کەرکوکی: لێکۆڵینەوەیەکی سەرپێیی دەربارەی پەرلەمانی ئەوروپا/ سیاسەتی دەولی (گۆڤار). هەولێر، ژمارە-٤- ١٩٩٣.
٢١- ک. حیسامی: داخوا ئەوە (ژینۆساید) نییە؟/ سەردەمی نوێ. ستۆکهۆڵم، ژمارە-٣٢- سێپتێمبەری ١٩٨٨.
٢٢- کرمانج گوندی: کوردستانی بندەستی سوریا/ سەردەمی نوێ. ستۆکهۆڵم، ژمارە-٤٥- سێپتێمبەری ١٩٩٠.
٢٣- کەمال میراودەلی: دوازدە ئەفرەتی کۆلۆنیالیزم لەکوردستاندا/ ڕابوون. ستۆکهۆڵم، ژمارە-٢- ١٩٩١.
٢٤- مارف عومەر گوڵ: ڕێکخراوی کوردی مافی مرۆڤ له کوردستانی عێراق/ گۆڵەس کوردا-دەنگی کورد (ڕۆژنامە). مۆسکۆ، ژمارە ٥،٦- ١٩٩٢. (بەزمانی ڕووسی).

٢٥- محمد سەعید سۆفی: کەندیناوە و سیاسەتی تەعریب و ڕاگواستن/ کوردستانی نوێ (ڕۆژنامە). هەولێر، ژمارە -١٥٤-، ١٩٩٢/٨/٢.

## ڕۆژنامە و گۆڤار و سەرچاوەی تر

٢٦- بەربانگ (گۆڤار). ستۆکهۆڵم ژمارە- ٥١ -، ١٩٨٨.

٢٧- بەربانگ. ستۆکهۆڵم، ژمارە-٥٨،٥٧- ١٩٨٩.

٢٨- بەربانگ. ستۆکهۆڵم، ژمارە-٧١-٧٢،- ١٩٩١.

٢٩- پەیڤ (گۆڤار). لەندەن، ژمارە-٤-، نیسانی ١٩٨٧.

٣٠- پێشەنگ (گۆڤار). ژمارە-١٢- ئابی ١٩٨٦.

٣١- خەبات (ڕۆژنامە). ژمارە-٥٧٥- کانوونی دووەم ١٩٨٨.

٣٢- خەبات. ژمارە-٦٢٨-، ١٩٩٢/٩/١٦.

٣٣- خەبات. هەولێر ژمارەی ڕۆژی ١٩٩٣/٢/١٤.

٣٤- ڕێبازی نوێ (ڕۆژنامە). ژمارە-١٠- تشرینی یەکەمی ١٩٨٨.

٣٥- ڕێبازی نوێ. ژمارە-٤- نیسانی ١٩٨٩.

٣٦- ڕێبازی نوێ. ژمارە-٤- ١٧ تشرینی دووەم ١٩٩١.

٣٧- سەردەمی نوێ (ڕۆژنامە). ستۆکهۆڵم، ژمارە-١٠- ١٩٨٩.

٣٨- سەربەخۆیی (ڕۆژنامە). ژمارە-٢٤، ٢٥- تەممووز ئابی ١٩٩٠.

٣٩- کوردستان (ڕۆژنامە). ژمارە--٢٠٠-ئووتی ١٩٩٣.

٤٠- کوردستان. ژمارە-٢١٣-سێپتێمبەری ١٩٩٤.

٤١- کوردستانی نوێ (ڕۆژنامە). هەولێر، ژمارە-٩٥- ١٩٩٢/٥/١٨.

٤٢- کوردستانی نوێ. ژمارە-٧٦- ١٩٩٢/٤/٢٦.

٤٣- کوردستانی نوێ. ژمارە-٢٤٨- ١٩٩٢/١١/٢٢.

٤٤- کوردستانی نوێ. ژمارە-٢٥٣- ١٩٩٢/١١/٢٦.

٤٥- کوردستانی نوێ. لەندەن. چاپی دەولی، ژمارە-٤- تشرینی یەکەم ١٩٩٤.

٤٦- هەڵوێست (گۆڤار). لەندەن، ژمارە-٣- ٤٨، ١٩٨٧.

٤٧- یەکگرتن (ڕۆژنامە)، ژمارە-٩- کانوونی دووەمی ١٩٩٣.

***

٤٨- بەڵگەنامەی UN، ١٢/٠٩/.١٩٨٨ CD/872، کۆنگرەی چەک دامالین. (دەقی ڕووسی).
٤٩- بەڵگەنامە .UN. E/CN. Sub/٤ ،١٩٨٨، ٢٠ (دەقی ڕووسی).
٥٠- بەڵگەنامە UN، ئەنجومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی: CN/E. ٤ 31/1992 - (دەقی ڕووسی).
٥١- بەڵگەنامەی UN، ئەنجومەنی ئاسایش: S/ ٢٣٦٨٥/ .Add.1 9 March 1992 (دەقی ڕووسی).
٥٢- بەڵگەنامەی UN، ئەنجومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی: .E/CN.4/ 1993/45 (دەقی ڕووسی).
٥٣- ڕاپۆرتی ئەمنیستی ئنتەرناشناڵ، ژمارە: .MDE 14-01-88
٥٤- ڕاپۆرتی ئەمنیستی ئنتەرناشناڵ، ژمارە: .MED 14-03-89
٥٥- ڕاپۆرتی ئەمنیستی ئنتەرناشناڵ، ژمارە: .MDE 13-10-92
٥٦- ایران: نقض حقوق بشر ١٩٨٧-١٩٩٠ سازمان عفو بین الملل، شمارە: MDE 31-21-92.
٥٧- بولتن خبری کردستان. شمارە-٢٥٨-سبتامبر ,١٩٩١ حزب دمکرات کردستان ایران. نمایندگی خارج از کشور.
٥٨- کۆمەڵێ بەڵگەنامەی: Kurdistan Human Right Commision Maastricht. 27 Januari 1992.
٥٩- بانگەوازێکی جیهانی بۆ پشتگیری کردنی گەلی باکووری کوردستان. وەرگێڕانی: ئەزمند بەگیخانی/ هەنگاو (ڕۆژنامە)ی لەندەن، ژمارە ٦- ١٩٩٤.
٦٠- لیژنەی باڵای ئاوارەکانی کوردستانی عێراق. نەخشە و ئاماری سەرژمێری ئاوارەکان لە ئوستانەکانی ئیراندا؟ ئابی ١٩٨٩.
٦١- ئەڵمانیاو جینۆساید لە عێراق، کۆمەڵەی هاوکاری کردنی گەلانی چەوساوە، گوتینگن، ڕاپۆرتی ژمارە-٤- ١٩٩١. (بە ئینگلیزی و ئەڵمانی).
٦٢- سەرژمێری گشتی دێهات و شارۆچکە وێرانکراوەکانی پارێزگای کەرکووک، ١٩٨٧- ١٩٨٨. ڕاگەیاندنی لقی کەرکووکی حیزبی سۆسیالیستی کوردستانی عێراق.؟ ١٩٨٩.

بەزمانی عەرەبی:


٦٣- اشيريان. ش. ح. الحركة الوطنية في كردستان العراق. ١٩٦١-١٩٦٨، عربه عن الروسية: ولاتو، بيروت ١٩٨٧.

٦٤- خالد خالد: كيف تعالج الدساتير العراقية الحقوق القومية للشعب الكردي، ستوكهولم، ١٩٩٠.

٦٥- رينية موريس: كردستان أو الموت. ترجمة جرجيس فتح الله المحامي. لندن، ١٩٨٦.

٦٦- عبدالباقي احمد (دكتور): حقائق عن اللاجئين العراقيين الاكراد في تركيا. ترجمة: فريدون فەيزەلك. منشورات الجبهة الكردستانية، ١٩٨٩.

٦٧- عبدالرحمن قاسملو (دكتور): كردستان والاكراد. ترجمة ثابت منصور.؟ ١٩٦٨.

٦٨- كمال مظهر احمد (دكتور): دراسات في تأريخ ايران الحديث والمعاصر. بغداد، ١٩٨٥.

٦٩- محمد طلب هلال: دراسة عن محافظة الجزيرة من النواحي القومية، الاجتماعية والسياسية، سوريا، الحسكة، ١٩٦٣.

٧٠- محمد العودات (دكتور): التلوث وحماية البيئة. دمشق، ١٩٨٨.

٧١- مجيد جعفر (دكتور): كردستان تركيا- دراسة اقتصادية، اجتماعية وسياسية في تحت التخلف الاستعماري. بيروت، ١٩٩٠.

٧٢- منذر الموصلي: عرب واكراد-رؤية عربية للقضية الكردية. بيروت، ١٩٨٦.

٧٣- منذر الموصلي: الحياة السياسية والحزبية في كردستان. لندن ١٩٩١.

٧٤- هسرتيان. م. أ. : كردستان تركيا بين الحربين ترجمة: د. سعدالدين ملا، باقي نازي. بيروت، ١٩٨٧.

٧٥- وليام ايغلتن الابن: جمهورية مهاباد. ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله المحامي. بيروت، ١٩٧٢.

٧٦- وليد حمدي (دكتور): الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية. لندن، ١٩٩٢.


لێکۆڵینەوەو وتار بە زمانی عەرەبی:


٧٧- اسماعيل بيشكجي: دفاعا عن الامة الكردية المستعبدة-رسالة الى اليونيسكو-

القسم الخامس، ترجمة روناك/ جريدة گەل- الشعب، العدد ١٩، اواخر تشرين الاول، ١٩٨٥.
٧٨- جبار قادر (دكتور): الدستور التركي وسياسة قهر الاكراد/ جريدة المنار الكردي. لندن، العدد ٢٠، ٢٢ تشرين الاول ١٩٩٤.
٧٩- حميد بوز رسلان: حول (الاطروحة التركية في التأريخ) دراسات كردية. باريس، العدد ٣،٧، ١٩٩٢.
٨٠- عبدالرحيم صدقي (دكتور): دراسة للمباديء الاصولية للقانون الدولي الجنائي في الفكر المعاصر/ المجلة المصرية للقانون الدولي. المجلد الاربعون، القاهرة، ١٩٨٤.
٨١- عصمت شريف وانلي: حول الاستراتيجية السياسية والعسكرية للحركة الوطنية الكردية/ دراسات كردية. باريس، العدد ١،٢ كانون الثاني، ١٩٨٥.
٨٢- كمال غمبار: القضية الكردية من وجهة نظر حزب البعث/ جريدة گەل/ الشعب- العدد ٥٠، أب ١٩٩٢.
٨٣- كندال نزان: اكراد تركيا-الاضطهاد القومي واشكاله/دراسات كردية. باريس، العدد ١،٢ كانون الثاني ١٩٨٥.
٨٤- لازريف. م. س. : الاكراد والقضية الكردية. ترجمة س. ولات/ جريدة گەل- الشعب- العدد ٨ حزيران ١٩٨٤.
٨٥- مصطفي سلامة حسين (دكتور): تأملات دولية في حقوق الانسان/ المجلة المصرية للقانون الدولي. المجلد الاربعون. القاهرة ١٩٨٤.
٨٦- ميري كوجار: الاكراد والمسألة الكردية في علم التأريخ التركي/ مجلة الثقافة الجديدة. العدد-١٧٢- نيسان ١٩٨٦.
٨٧- نوري طالباني (دكتور): كردستان- الحقوق القومية والفيدرالية والدستور/ المنار الكردي. لندن، العدد-٨- ايلول ١٩٩٣.

## ڕۆژنامە و گۆڤار و سەرچاوەی تر

٨٨- الشرارة. جريدة الاتحاد الوطني الكردستاني. العدد -٣- اذار ١٩٨٩.
٨٩- الشرارة. العدد ٧ تموز ١٩٨٩.
٩٠- اخبار كردستان. العدد ١٧١- ١/٢/١٩٨٨.

٩١- الف باء. بغداد العدد١٠٤٢- ٢ أيلول ١٩٨٨.

٩٢- المثقف التقدمي: نشرة يصدرها الحزب الديمقراطي التقدمي الكردي في سوريا، العدد ٧- ١٩٨٩.

٨٣- الوقائع العراقية: العدد- ٣١٥٨- ١٣ تموز ١٩٨٧.

٩٤- دراسات كردية: باريس، العدد- ٣، ٧- ١٩٩٢.

٩٥- رسالة العراق: الحزب الشيوعي العراقي. اعلام الخارج. العدد ٩٩-تموز ١٩٨٩.

٩٦- صدى كردستان. جريدة الحزب الديمقراطي الكردستاني- العراق. مكتب لبنان، العدد ٣٢- أوائل تموز ١٩٩٠.

٩٧- طريق الشعب. الجريدة المركزية للحزب الشيوعي العراقي. العدد ٧ أواسط تشرين الاول ١٩٩١.

٩٨- طريق الحرية. جريدة الحزب الاشتراكي الكردستاني- العراق. العدد١٢،١٤- تشرين الثاني ١٩٨٨.

٩٩- كردستان اليوم. نشرة دورية تصدرها لجنة التضامن مع الشعب الكردي. بروكسل، العدد السابع، نيسان ١٩٨٩.

١٠٠- گەل- الشعب-جريدة حزب الشعب الديمقراطي الكردستاني. العدد ١٧ أوائل أب ١٩٨٥.

١٠١- گەل- العدد ١٨ أوائل ايلول ١٩٨٥.

١٠٢- گەل- العدد ٢٠ كانون الثاني ١٩٨٦.

١٠٣- المنظمة العربية لحقوق الانسان- نشرة اخبارية- العدد- ٤٩ كانون الثاني ١٩٩٢.

١٠٤- أمر. مديرية أمن محافظة دهوك. العدد-٤٨- ٦/٣/١٩٩١.

١٠٥- تقرير فان دير ستويل حول حقوق الانسان في العراق/ المنار الكردي. لندن، العدد-٥- ١٩٩١.

١٠٦- تقرير خاص الى الكونفرس الامريكي حول استخدام الاسلحة الكيمياوية. ترجمة: آمانج. مطبعة الشهيد صالح اليوسفي، ١٩٨٨.

١٠٧- حقوق الانسان: نشرة دورية تصدرها لجنة الدفاع عن حقوق الانسان في العراق.

العدد- ١٦- آب ١٩٩١.

١٠٨- حقوق الانسان: نشرة دورية تصدرها لجنة الدفاع عن حقوق الانسان في العراق. العدد-١٨- كانون الاول ١٩٩١.

١٠٩- حلبجة المدينة الدامية. الجزء الاول. منشورات المكتب الاعلامي للحزب الاشتراكي الكردستاني- العراق، فرع السليمانية ١٩٨٩.

١١٠- شهادات تفضح انتهاكات حقوق الانسان في العراق. اصدار لجنة الدفاع عن حقوق الانسان في العراق، دمشق ١٩٩٠.

١١١- قرار. حزب البعث العربي الاشتراكي. قيادة شعبة زاخو. العدد-س/ش/٦٦٤- في ١٩٨٧/٦/١٤.

١١٢- مذكرة الجبهة الكردستانية العراقية. منشورات الجبهة الكردستانية ١٩٨٩.

١١٣- مسألة الاقليات القومية في الوطن العربي. منشورات حزب البعث العربي الاشتراكي. القيادة القومية. المؤتمر القومي الحادي عشر. دار الثورة. بغداد

١١٤- منظمة العفو الدولي. التقرير السنوي. لندن ١٩٩١.

١١٥- نداء الى الرأي العام الاوروبي والعالمي. الحزب الديمقراطي الكردستاني- فرع اوروبا، ٤ كانون الثاني ١٩٧٤.

١١٦- وثائق عن محنة شعب كردستان العراق (٢). قسم الاعلام في المكتب السياسي للحزب الديمقراطي الكردستاني- العراق، ١٩٨٨.

Абаринов В.П., Красулин Б.П. Разоружение. - Москва, 1988.

Андрюхин М.Н. Геноцид – тягчайшее преступление против человечества. - Москва, 1961.

Андрюхин М.Н. Геноцид в политике империалистических государств. - Москва, 1967.

Аристова Т.Ф. Материальная культура курдов XIX – перв. пол. XX в. - Москва, 1990.

Блюнчли И. Современное международное право цивилизованных государств, изложенное в виде кодекса. - Москва, 1978.

Броунли Я. Международное право. Книга 2 /Пер. с англ. С.Н.Андриянова. - Москва, 1977.

Буткевич В.Г. Соотношение внутригосударственного и международного права. - Киев, 1981.

Василенко В.А. Международно-правовые санкции. - Киев, 1982.

Василенко В.А. Ответственность государства за международные правонарушения. - Киев, 1976.

Введение в философию. Кол. авт. - В 2-х частях. - Ч.2. - Москва, 1989.

Гасратян М.А. Курды Турции в новейшее время. - Ереван, 1990.

Гасратян М.А. Новая турецкая конституция и курдский вопрос// Турция и современность. - Москва, 1989.

Губин В.Ф. Рассовая дискриминация: реакционная сущность и международная противоправность. - Москва, 1979.

Давид В., Василенко В. Механизм охраны международного правопорядка. - Брно, 1986.

Де Аречага Э.Х. Современное международное право. - Москва, 1983.

Демченко П. Иракский Курдистан в огне. - Москва, 1963.

Деятельность ООН в области прав человека. О признании самоопределения в качестве права человека. - Нью-Йорк, 1983.

Дипломатический словарь. - Т.1. - Москва, 1984.

- Ежегодник комиссии международного права 1985 г. - Т.1. - Нью-Йорк, 1988.
- Ежегодник комиссии международного права 1986 г. - Т.II., часть I, часть II, Нью-Йорк, 1989.
- Карпец И.И. Преступление международного характера. - Москва, 1979.
- Карпец И.И. Международная преступность. - Москва, 1988.
- Конституция государств Ближнего и Среднего Востока /Перевод под ред. И.Д.Левина. - Москва, 1956.
- Краткий политический словарь. - Кол. автор. - Москва, 1989.
- Куликов Р.О. Международно-правовая ответственность за нарушение прав человека. - Москва, 1979.
- Курс международного права. В 7-ми томах. - Т.1. - Москва, 1989.
- Курс международного права. В 7-ми томах. - Т.3. - Москва, 1990.
- Лазарев М.С. Курды и Курдистан // Национальный вопрос в освободившихся странах Востока. - Москва, 1986.
- Мазов В.А. Ответственность в международном праве. - Москва, 1979.
- Манийчук Ю.В. Последствия международного правонарушения. - Киев, 1987.
- Мгои Ш.Х. Курдский национальный вопрос в Ираке в Новейшее время. - Москва, 1991. - С. 216-217.
- Международное право в документах. - Москва, 1952.
- Международная политика Новейшего времени в договорах, нотах и декларациях /Под ред. Ю.В.Ключникова и А.В.Сабанина. - Ч.III. - Вып. II. - Москва, 1929.
- Международный порядок: политико-правовые аспекты / Под ред. Г.Х.Шахназарова. - Москва, 1986.
- Мингазов Л.Х. Эффективность норм международного права. - Казань, 1990.
- Никитин В. Курды. - Москва, 1964.

- Николаев А.И. Токио: суд народов. - Москва, 1990.
- Низоматов Ш.А. Ирано-Иракский конфликт. - Москва, 1989.
- Нюрнбергский процесс. В 8-ми т. - Т.1. - Москва, 1987.
- Правда. - 1990. - 3 апреля. - N 93 /26176/.
- Резолюция Генеральной Ассамблеи ООН 96/I от 11 декабря 1946г.
- Резолюция Генеральной Ассамблеи ООН 260/III от 9 декабря 1948г.
- Решетов Ю.Л. Борьба с международными преступлениями против мира и безопасности. - Москва, 1983.
- Устав ООН. - Москва, 1978.

* * *

- David McDowall. The Kurds. The Minority Rights Group Report. London, 1989.
- Documentation of the international Conference on Human Rights in Kurdistan. Bremen, 1989.
- International Court of Juistice Reports 1951.
- Jeromy Webb. Iraq Canght out over nerve gas attack//New Scientist. London, 1 May 1993.
- News from Helsinki Watch. News from Turkey. New York, June, 1990.

جینۆساید نەک هەر نەهێشتنی بەدەنی کۆمەڵێ مرۆڤە، بگرە جۆری تریشی هەیە، فەوتاندنی کەلتووری نەتەوەیی، جینۆسایدی بیۆلۆجی و ئابووری.
لە باکور و باشووری کوردستان، ڕێژیمی تورکیا و عێراق بە وێرانکردنی سەراپاگیری ناوچەکان، سەرباری سیاسەتی جینۆساید، تاوانی وێرانکردنی ئێکۆلۆجیایان ئەنجام داوە. ئەویش وێرانکردن و فەوتاندنی ژینگەیە، کە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی کوشتنی ژیان بەگشتی لەو ناوچانەدا.
بۆیە ئەم تاوانە ڕاستەوخۆ پێشێلکردنی بنەما و پرنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتانە، هەر لەبەر ئەوەش، تێپەڕبوونی کات لەبەرچاو ناگیرێ، واتە بەرپرسیارێتی لەسەر ئەو تاوانە هەر دەمێنێ و تاوانکار چ وەک حکوومەت یا فەرمانبەر و کارمەندی دەوڵەتان یا کەسانی ئاسایی نابێ قوتاربن.


چاپخانەی



هەولێر - کوردستان
Aras Press
Kurdistan - Erbil